# مێژووی

# خەلافەتی راشیدین

نووسینی

د. راغب السرجانی

وەرگێڕانی

هادی شارباژێڕی

# مێژووی خەلافەتی راشیدین

نووسینی: د. راغب السرجانی

وەرگێڕانی: هادی شاربازێڕی

بۆ پۆلی: یەکەمی ئامادەیی ئامەدی ئیسلامی

ساڵی: ٢٠١٩ز-١٤٤١ك

زانکۆی ئازادی دیراساتی ئیسلامی زادی

ماڵپەری زادی

www.zadyreman.com

فەیسبووك

www.fb.com/zadyreman

تویتەر

twitter.com/zadyreman

ئیمەیل

Zadyreman@gmail.com

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

إن الحَمْدَ لله نَحْمَدُهُ وَنَسْتَعينهُ ونَسْتَغْفرُهُ، وَنَعُوذُ بِالله منْ شُرُورِ أَنْفُسنا وَمنْ سَيِّئات أعْمَالنا، مَنْ يَهْده الله فَلا مُضِلَّ لَهُ، وَمَنْ يُضْلِلِ فَلا هادِيَ لَهُ. أَشْهَدُ أنْ لَا إِلَهَ إِلَّا الله وَأَشهَدُ أَنَّ مُحَمَّداً عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ.

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ حَقَّ تُقَاتِهِۦ وَلَا تَمُوتُنَّ إِلَّا وَأَنتُم مُّسۡلِمُونَ ١٠٢﴾ آل عمران: ١٠٢

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱتَّقُواْ رَبَّكُمُ ٱلَّذِي خَلَقَكُم مِّن نَّفۡسٖ وَٰحِدَةٖ وَخَلَقَ مِنۡهَا زَوۡجَهَا وَبَثَّ مِنۡهُمَا رِجَالٗا كَثِيرٗا وَنِسَآءٗۚ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ ٱلَّذِي تَسَآءَلُونَ بِهِۦ وَٱلۡأَرۡحَامَۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلَيۡكُمۡ رَقِيبٗا ١﴾ النساء: ١

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَقُولُواْ قَوۡلٗا سَدِيدٗا ٧٠ يُصۡلِحۡ لَكُمۡ أَعۡمَٰلَكُمۡ وَيَغۡفِرۡ لَكُمۡ ذُنُوبَكُمۡۗ وَمَن يُطِعِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ فَقَدۡ فَازَ فَوۡزًا عَظِيمًا ٧١﴾ الأحزاب: ٧٠ - ٧١

أمّا بَعْدُ:فَإِنَّ أَصْدَقَ الحَديث كتابُ الله، وَخَيرَ الهَدي هَدْيُ مُحَمَّد صَلَى اللهُ عَلَيْه وَسَلَمَ وَشَرّ الأُمورِ مُحْدَثاتُها، وَكُلَّ مُحْدَثَة بِدْعَةٌ وَكُلّ بِدْعَةِ ضَلالَةٌ، وَكُلَّ ضَلالَة فِي النَّارِ.

پێشکەش بێت

بە هەموو ئەو موسوڵمانانەی، کە بە بیرودیدێکی

فراوانەوە دەڕوانە موسوڵمانانی تر"

"سینە فراوانی و یەکتر قبوڵکردن،

با سەرەتای دەستپێکێکی نوێمان بێت"

# پێشەکی وەرگێڕ

إن الحمد لله نحمده ونستعينه ، ونعوذ بالله من شرور أنفسنا ومن سيئات أعمالنا من يهده الله فلا مضل ومن يضلل فلا هادي له ، وأشهد أن لا إله إلا الله وحده لا شريك له وأشهد أن محمدا عبده ورسوله...

خوێنەری بەڕێزو هێژا...

ئەم کتێبەی بەردەستت بەشێکە لە کتێبی (الموسوعة الميسرة في التأريخ الأسلامي)، کە نوسەری بەتوانا دکتۆر "راغب السرجاني" نووسیویەتی، کتێبەکە بە زمانی عەرەبی نوسراوە دوو بەرگی گەورەیە، باس لە مێژووی ئیسلام دەکات لە سەرەتای هاتنە دونیای پێغەمبەرەوە (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) هەتا رۆژگاری ئێستامان بە شێوەیەکی پوخت و کورت، نوسەر لە باسکردنی ئەم مێژووە دوورو درێژەدا نەهاتووە هەموو باس و خواسەکان بهێنێتەوە بەڵکو تیشکی خستۆتەسەر روداوە گرنگ و کاریگەرەکان، بەشی دووەمی کتێبەکە باس لە خەلافەتی راشیدین دەکات بە شێوەیەکی پوخت، منیش ئەو بەشەم وەرگێڕاوەتە سەر زمانی شیرینی کوردی، هیوادارم میللەتەکەم سودمەندبن لێی و بە چاوێکی کراوەوە کتێبەکە بخوێننەوە، وە شارەزای ئەوەبن کە سیستەمی حوکم و دەسەڵات لە سەردەمی چوار خەلیفەی راشیدین چۆن بووە و چی گوزەراوە لەو کاتەدا؟، هەروەها ئەو رووداو بەسەرهاتە کاریگەرانەی کە رویانداوە وێنەیەکی راست و دروستمان دەستبکەوێت، کە دوور بێت لە گێڕانەوەی لاوازو هەڵبەستراو قسەی نەشیاو بوختان بە هاوەڵانی پێغەمبەر (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)، زانین و شارەزابوون لە مێژووی دەسەڵاتی ئەو چوار خەلیفە بەڕێزە زۆر جێی بایەخە، چونکە ئەم چوار خەلیفەیە نزیکترین کەسانی دەوری پێغەمبەر بوون (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)، وە

زۆرتـرین هـاوەڵانی پێغەمـبەر لەو سـەردەمدا ژیـاون و دەوری کاریگەریـان هەبـووە لە رووداوەکانـدا، بـۆیە وەک زانایـان دەفەرمـوون قۆنـاغی راشـیدین نزیکترین قۆنـاغە لە روحـی ئیسـلامەوە لەدوای وەفـاتی پێغەمـبەر (صَـلَّى اللهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ) لە هەمـوو ڕەهەندەکانیەوە ئەگەر وردبینەوە لێی...

هادی شارباژێڕی

## خەلیفە ئەبوبەکری صدیق رضی الله عنه

## (لە رەبیعی یەکەم ١١ کۆچی بۆ جەمادی دووەم ١٣ کۆچی)

### هەڵبژاردنی ئەبوبەکری صدیق وەك یەکەمین خەلیفەی موسوڵمانان:

لەدوای وەفاتی پێغەمبەر (صَلَّى الله عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) هاوەڵە بەڕێزەکان جیاوازی کەوتە نێوانیان، هەندێکیان دەیان فەرموو: پێغەمبەر (صَلَّى الله عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وەفاتی کردووە، هەندێکی تریان دەیان فەرموو: وەفاتی نەکردووە، کاتێك ئەبوبەکری صدیق هەواڵەکەیان پێ ڕاگەیاندو هات، چووە ماڵی پێغەمبەر (صَلَّى الله عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) ئەو پۆشاکەی کە پێغەمبەریان پێ داپۆشی بوو لایبرد و سەیری ڕووی پێغەمبەری کرد (صَلَّى الله عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) ، لەدوای ئەوەی کە دڵنیابۆوە پێغەمبەر(صَلَّى الله عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وەفاتی کردووە، چووە دەرەوە بۆ ناو خەڵکی و وتارێکی بۆدان و فەرمووی: (هەرکەس موحەممەدی دەپەرست ئەوا موحەممەد وەفاتی کرد، هەرکەسێکیش خوای دەپەرست ئەوا خوای گەورە زیندووە و هەرگیز نامرێت، پاشان ئەم ئایەتەی خوێندەوە:

﴿ وَمَا مُحَمَّدٌ إِلَّا رَسُولٌ قَدْ خَلَتْ مِن قَبْلِهِ ٱلرُّسُلُۚ أَفَإِيْن مَّاتَ أَوْ قُتِلَ ٱنقَلَبْتُمْ عَلَىٰٓ أَعْقَـٰبِكُمْۚ وَمَن يَنقَلِبْ عَلَىٰ عَقِبَيْهِ فَلَن يَضُرَّ ٱللَّهَ شَيْـًٔاۗ وَسَيَجْزِى ٱللَّهُ ٱلشَّـٰكِرِينَ ﴿١٤٤﴾ ﴾

آل عمران: ١٤٤، واتە: موحەممەد (صلی الله علیه وسلم) تەنها پێغەمبەرێکە (نەمر نی یە) بێگومان لەپێش ئەو پێغەمبەرانی تر ڕابوردون جا ئایا ئەگەر وەفاتی کرد یان کوژرا دەگەڕێنەوە بۆ دواوەی خۆتان(پاشگەز دەبنەوە) .[1]

کاتێك ئەم ئایەتەی خوێندەوە بۆ خەڵکی، ئیمامی عومەر وەك ئەوەی یەکەم جاربێت ئەم ئایەتەی بیستبێت، دڵی ئارامی گرتوو روخساری هێدی بۆوە، موسوڵمانان لە

[1] تەفسیری ڕامان لە ماناو مەبەستی قورئان (احمد کاکە محمود )

سەقیفەی بەنی ساعیدە کۆبونەوە بۆ ئەوەی یەکێك هەڵبژێرن بۆ بوون بە خەلیفەی جێنیشینی پێغەمبەر (صَلَّى الله عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وە سەرکردایەتی کردنی موسوڵمانان، لەدوای چەندین گفتوگۆ لەسەر ئەوە رێکەوتن کە ئەبوبەکری صدیق ببێتە جێنشینی پێغەمبەر (صَلَّى الله عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وە موسوڵمانان بەیعەتیان پێدا، هیچ کەس نەما بەیعەت نەدا هەتا عەلی کوڕی ئەبوتالیبیش بەیعەتی دا، ئەو کەسانەی دەنگۆی ئەوە بڵاودەکەنەوە کە عەلی بەیعەتی دواخستبێت دوورە لە ڕاستی .

ئیبن و کەثیر دەڵێت : (بەیعەت دانی عەلی بە ئەبوبەکری صدیق یان لە ڕۆژی یەکەمدا بووە یان لە ڕۆژی دووەم، هیچ کات عەلی لە ئەبوبەکر جیانەبۆتەوە و هەموو کات هاوڕێ و هاودەمی بووە، هەرگیز نەبووە نوێژ لەدوای ئەبوبەکرەوە نەکات، لەگەڵ ئەبوبەکردا دەرچوو بۆ جەنگی ((ذي القصة)) کە ئەبوبەکر شمشێری بەرزکردبۆوە بۆ کوشتاری هەڵگەڕاوەکان، کەلەدواتر باسیان دێت، بەڵام ئەوەی کە هەیەو باس دەکرێت دەربارەی فاطمە (ﷺ) دڵگران بوونی فاطمەیە بەرامبەر بە ئەبوبەکر، بەهۆکاری ئەوەی کە فاطمە پێی وابووە ئەو میراتەی لە پێغەمبەرەوە (صَلَّى الله عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بۆی ماوەتەوە ئەبوبەکر نایداتێ [1]، هەروەك پێمان گەیشتووە ئەبوبەکر هەموو هاوەڵانی کۆکردەوە فەرمووی: لەپێغەمبەر (صَلَّى الله عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بیستووە فەرموویەتی: (إنا معشر الأنبياء لا نورث، ما تركنا فهو صدقة) واتە: (ئێمەی کۆمەڵی پێغەمبەران میراتمان لێناکەوێ وە هەرچیش لەدوامان بەجێ بمێنێ دەکرێتە خێر)

---

٢ لم يترك رسول الله صَلَّى الله عَلَيْهِ وَسَلَّمَ دينارا ولا درهما، ولا عبدا ولا أمة، ولاشاة ولا بعيرا ولا شيئا يورث عنه، بل أرضا جعلها كلها صدقة لله عزوجل، بل توفي صَلَّى الله عَلَيْهِ وَسَلَّمَودرعه مرهونة عند يهودي بثلاثين دينارا!!

کاتێك ئەبوبەکر ئەم فەرمودەیەی خوێندەوە بووە بەڵگەیەکی بەهێز بۆ قسەکانی ئەبوبەکر، پاشان هەم فاطمە (ﷺ) وە هەم مامەکانی پێغەمبەر (صَلَّى الله عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بێدەنگ بوون لە ئاستی فەرمایشتەکەی پێغەمبەر(صَلَّى الله عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) ، ئەوەی داواشیکرد فاطمە بەمیراتی پێی ببەخشرێت ئەو زەویانەی خەیبەر بوون، بەڵام ئەبوبەکر رەتیکردووە بیان داتێ و ئەوەشی بەو فەرمودەیە رونکردەوە، پاش شەش مانگ لە وەفاتی پێغەمبەر(صَلَّى الله عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فاطمەش وەفاتیکرد، ئەگەر ناخۆشیەکی وا هەبوایە لەنێوان فاطمەو ئەبوبەکر وەك ئەوەی شیعەکان دەیڵێن، دەبوایە عەلی لەدوای وەفاتی فاطیمە هەڵوێستیمان ببینایە بەرامبەر ئەبوبەکر، بەڵام ئەوی کردی عەلی ئەوەبوو چوو بەیعەتی نوێکردەوە بە ئەبوبەکر لەگەڵ ئەوەی پێشتریش بەیعەتی پێدابوو.

یەکەمین وتاری ئەبوبەکر کاتێك بوو بەخەلیفە ئەم وتارە گرنگەبوو: "أَيّهَا النّاسُ! فَإِنّي قَدْ وُلّيت عَلَيْكُمْ وَلَسْت بِخَيْرِكُمْ, فَإِنْ أَحْسَنْت فَأَعِينُونِي؛ وَإِنْ أَسَأْت فَقَوّمُونِي. الصّدْقُ أَمَانَةٌ وَالكَذِبُ خِيَانَةٌ. وَالضّعِيفُ فِيكُمْ قَوِيّ عِنْدِي حَتّى أُرِيحَ عَلَيْهِ حَقّهُ إِنْ شَاءَ اللّهُ, وَالقَوِيّ فِيكُمْ ضَعِيفٌ عِنْدِي حَتّى آخُذَ الحَقّ مِنْهُ إِنْ شَاءَ اللّهُ. لا يَدَعُ قَوْمٌ الجِهَادَ فِي سَبِيلِ اللّهِ إِلا ضَرَبَهُمْ اللّهُ بِالذّلّ. وَلا تَشِيعُ الفَاحِشَةُ فِي قَوْمٍ قَطّ إِلا عَمّهُمْ اللّهُ بِالبَلَاءِ. أَطِيعُونِي مَا أَطَعْت اللّهَ وَرَسُولَهُ, فَإِذَا عَصَيْتُ اللّهَ وَرَسُولَهُ فَلا طَاعَةَ لِي عَلَيْكُمْ".

واتە: ((بووم بەسەرگەورەتان و لەکەسیشتان باشترنیم، ئەگەر باشم کرد کۆمەکیم بکەن، ئەگەر خراپم کرد راستمبکەنەوە، راستگۆی راسپاردەیە، درۆکردنیش ناپاکیە،

لە لای من لاوازتان بەهێزتانە، ان شاءالله تۆڵەی بۆ دەکەمەوە، وە بەهێزیشتان لاوازە لە لام تا ان شاءالله تۆڵەی لێدەسێنم، هیچ گەلێك جیهاد و گیان فیدایی لە پێناوی خـوادا واز لێناهێنێـت، مەگـەر خـوا سـەر شـۆڕیان دەکـات، بەدڕەوشـتیش لـەناو هەرگەلێکدا ئاشکرابێت، خوای گەورە بەڵای سەرتاسەرتان بۆ دەنێرێت، تا گوێڕایەڵی خودام، گوێڕایەڵم بن، ئەگەر سەرپێچیم کرد بۆتان نیە بە گوێم بکەن.

**جەنگی هەڵگەڕاوەکان:**

لەسەردەمی پێغەمبەردا (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بزوتنەوەی هەڵگەڕاوەکان سەریهەڵدا، موسەیلەمەی درۆزن لە یەمامە مورتەد بۆوە، وە ئەسوەدی عەنسی لە یەمەن، وە تەلیحەی کوڕی خوەیلد لە بەنی ئەسەد، وە ئافرەتێك لە بەنی تەمیم بەناوی سەجاح کە لە جەزیرەیەك دەژیا، ئەمانە هەمووی لە پێش وەفاتی پێغەمبەر (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) مورتەد بونەوە، پێغەمبەر(صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) سوپایەکی بۆ ناردن هەتا هەمویان لەناوبات، بەڵام پێش ئەوەی کۆتاییان پێبێت پێغەمبەر(صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وەفاتیکرد.

ئەوکەسانەی مورتەدبوونەوە داوای دەسەڵاتیان دەکرد و قەومەکانیشیان بە نەزانی و بێ بیرکردنەوە بوونە شوێنکەتویان، ئەبوبەکر هەستا بە لەناوبردنیان و جەزیرەی عەرەبی پاکردەوە لێیان، ئەمەش گەورەترین کێشەبوو کە توشی ئەبوبەکر بۆوە لە کاتی خەلافەتیدا، وە توانیشی زاڵبێت بەسەریاندا، بەڕاستی جەنگی هەڵگەڕاوەکان گەورەترین فیتنەبووە کە توشی ئوممەتی موسوڵمان بووە لە مێژوودا...

**خستنەڕێی سوپای ئوسامە:**

لەگەڵ بوونی ئەو فیتنە گەورەیەی مورتەدبووەکان، ئەبوبەکر خۆی ئامادەکرد بۆ جێبەجێ کردنی وەسیەتی پێغەمبەر(صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بۆ بەڕێکردنی سوپای ئوسامە، کە ئەم سوپایە پێغەمبەر (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بۆخۆی ئامادەباشی بۆکردبوو کەبەرەو وڵاتی رۆم بەڕێی بکات.

خستنەڕێی ئەم سوپایە و پابەندبوون بە ڕێنمایەکانی پێغەمبەر (صَلَّى الله عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) ، کاریگەریەکی زۆری هەبوو لەکەمکردنەوەی فیتنەی مورتەدبووەکان، ئەمەش ئەبو هورەیرە بۆمان روندەکاتەوە و دەگێڕێتەوە و دەفەرموێت: ((سوێند بەو خوایەی کە هیچ پەرستراوێك نیە بێجگە لەئەو ، ئەگەر ئەبوبەکر نەبوایە بە جێنشینی پێغەمبەر(صَلَّى الله عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) ئەوا کەس نەدەما خوا ببەرستێت، پاشان هەمان قسەی دوبارەکردەوە، پاشان بۆ جاری سێیەمیش هەمان شتی وتەوە، ئەوانەی لەدەوری بوون وتیان چیە ئەبا هورەیرە؟

فەرمووی: پێغەمبەر(صَلَّى الله عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) ئوسامەی کوڕی زەیدی لەگەڵ حەوت سەد کەس ئاراستەکرد بەرەو شام، کاتێك گەیشتنە ناوچەی (بذي خشب) کە دۆڵێکە نزیکی شەوە ڕێیەك بەپێ دورە لە مەدینەوە، پێغەمبەر(صَلَّى الله عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وەفاتیکرد وە عەرەبەکانی دەوری مەدینەش مورتەدبونەوە، هاوەڵانی پێغەمبەر (صَلَّى الله عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) کۆبونەوەو وتیان: ئەی ئەبوبەکر پێویستە بەرامبەر ئەو خەڵکە مورتەدبۆوە بوەستینەوە، بەڵام جەنابت سوپای ئوسامەت ئامادەکردووە بۆ ڕۆمەکان لەکاتێکدا کە ئەو عەرەبانەی دەوری مەدینە هەن و ترسی ئەوە هەیە بدەن بەسەر مەدینەدا، ئەبوبەکر فەرموی: سوێندبەو خوایەی کە هیچ خوایەك نیە بێجگە لەئەو، ئەگەر سەگ بێت و پەلاماری قاچی خێزانەکانی پێغەمبەر بدەن ئەو سوپایەی کە پێغەمبەر خۆی ئاراستەی کردووە نایگەڕێنمەوە، وە ئەو لیوایەی پێغەمبەر(صَلَّى الله عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) دای ناوە بە سەرکردایەتی ئوسامە دەبێت و هەرواش دەمێنێتەوە، کاتێك ئەبوبەکر ئەنجامیدا، ئەو هۆزە عەرەبانەی دەیان ویست مورتەد ببنەوە وتیان: ئەگەر ئەوانە هێزیان وەك هێزی ئێمەبێت، چۆن دەکرێ ئێمەش هەین و ئەوان هێز دەنێرن بۆ

ڕۆمەکان، جەنگیشیان لەگەڵ دەکەن و بە سەلامەتیش گەڕاونەتەوەو سەرکەوتوش بوون بەسەریاندا، ئەم کارە بووە هۆی ئەوەی عەرەبەکان بترسن و بگەڕێنەوە بۆناو ئیسلام کاتێك هێزی موسڵمانانیان بینی بەو شێوەیە))، رەحمەتی خوای گەورە بڕژێ بەسەر ئیمامی ئەبوبەکر کە بووە هۆی ڕزگارکردنی ئوممەت لەو فیتنەگەورەیەی تێکەوت...

ئەبوبەکر سوپاکەی ئوسامەی بەڕێکرد کە گەنجێکی تازە پێگەیشتوبوو، بە ڕۆیشتنەوە کۆمەڵێ ئامۆژگاری کرد، لەکاتێکدا ئەبوبەکر بە پێ دەڕۆیشت و ئوسامەش بە سواری، ئوسامە وتی: ئەی جێنشینی پێغەمبەر(صَلَّى الله عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) یان تۆش وەك من بە سواریەوە ئامۆژگاریەکانت بکە، یان منیش وەك جەنابت بەپێ دەڕۆم، ئەبوبەکر وتی: سوێندبەخوا نە تۆ دادەبزی و نە منیش سەردەکەوم چی تیایە ئەگەر لەپێناوی خوادا قاچەکانم خۆڵاوی ببن، پاشان ئەبوبەکر داوای لە ئوسامەکرد کە عومەر لای ئەم بمێنێتەوە وەك یارمەتیدەرێك و وەزیرێکی ئەبوبەکر، ئوسامەش رازی بوو بەوە.

ئەگەر بگەڕێینەوە بۆ روداوی بزوتنەوەی هەڵگەڕاوەکان، دەتوانین بڵێین هەڵگەڕانەوەکە لە دوو ئاستدا خۆی دەبینیەوە:

هەندێکیان بە تەواوی هەڵگەڕابونەوە دەستبەرداری ئیسلام بوبون، کۆمەڵێکی تریان کە شوێنکەوتەی کەسانێك بوون لە ناوچەکانی (طیء و حنیفة و أسد و تمیم و الیمن) دەژیان، ئەمانە باوەڕیان وابوو کە زەکات تەنها بە پێغەمبەر(صَلَّى الله عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) دەدرێت ئەویش کە ئێستا نەماوە بەکەسی تری نادەن، بە دەلیلی ئەم ئایەتە ئەم بۆچونەیان بۆخۆیان دروستکردبوو ﴿خُذۡ مِنۡ أَمۡوَٰلِهِمۡ صَدَقَةٗ تُطَهِّرُهُمۡ وَتُزَكِّيهِم بِهَا

﴿وَصَلِّ عَلَيْهِمْۖ إِنَّ صَلَوٰتَكَ سَكَنٌ لَّهُمْۗ وَٱللَّهُ سَمِيعٌ عَلِيمٌ ١٠٣﴾ التوبة: ١٠٣، واتە: (لە هەندێ ماڵ و سامانی ئەو (ئیمانداران) زەکات و خێر وەربگرە، چونکە دەبێتە هۆی خاوێن کردنەوەی ماڵەکانیان و پاککردنەوەی دڵ و دەروونیان و دۆعای داباریني ڕەحمەت بکە بەسەریاندا و ئەگەر مردیشن نوێژیان لەسەر بکە، چونکە بەڕاستی دۆعاو نوێژ کردنی تۆ مایەی دڵنیایی و ئارامی‌یە بۆیان، خوایش هەمیشە بیسەر و زانایە).

ئەم ئایەتەیان تەئویل کردبوو بەوەی کە زەکات بەس بە پێغەمبەر(صَلَّى الله عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) ئەدرێت نەك بە ئەبوبەکر، بۆ ئەم کۆمەڵەیان بوو عومەر چوو بە ئەبوبەکری وت: دەتەوێ ئەو خەڵکانە بکوژی؟ لە کاتێکدا پێغەمبەر(صَلَّى الله عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرمویەتی: (أمرت أن أقاتل الناس حتى يقولوا لا إله إلا الله فإذا قالوها عصموا مني دماءهم وأموالهم إلا بحقها)، واتە: (فەرمانم پێکراوە لەگەڵ خەڵکی بجەنگم تا شایەتی دەدەن هیچ خوایەك نیە جگەلە (الله) و ئەگەر وتیان ئیتر خوێن و ماڵیان لەسەرم قەدەغەیە مەگەر بە حەقی خۆی).

ئەبوبەکر وتی: سوێند بە خوا ئەگەر بزنە مێیەکم نەدەنێ کە کاتی خۆی بە پێغەمبەری خوایان (صَلَّى الله عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) داوە لەگەڵیاندا دەجەنگم، زەکات مافێکی سامانەکەیانە، سوێند بە خوا دەجەنگم لەگەڵ ئەوانەدا جیاوازی دەکەن لە نێوان نوێژو زەکاتدا.

عومەر وتی: سوێند بە خوا ئەوە خوای گەورە خستویەتیە دڵی ئەبوبەکرەوە و هەر ئەمەش ڕاستە.

ئەبوبەکر سوپای ئیسلامی کرد بە (١١) لیواوە و هەموو لیوایەکیش سەرکردەیەکی بۆ دانا بۆ جەنگ کردن لە دژی هەڵگەڕاوەکان لە سەرتاپای جەزیرەی عەرەبی، لیواکانیش بەم شێوەیە بوون:

١-سوپای (خالد کوڕی وەلید)ی نارد بۆ ناوچەی نەجد کە طەلیحەی کوڕی خوەیلید لە بەنی ئەسەد لەوێبوو، کاتێك خالد طەلیحەی لەناوبرد چوو بۆ ناوچەی البطاح کە مالك کوری نوەیری لێ بوو لە بەنی تەمیم بوو.

٢-سوپای (عیکرەمەی کوڕی ئەبی جەهل) چوو بۆ یەمامە کە موسەیلەمەی کوڕی حەبیب ناسراوە بە درۆزن لە بەنی حنیفە بوو.

٣-سوپای (شەرحبیلی کوڕی حەسەنە) چوو بۆ یەمامە بەهەمان شێوە.

٤-سوپای (طریفە کوڕی حاجز) چوو بۆ ناوچەی بەنی سلیم و وە لەگەڵ هەڵگەڕاوەکانی هەوازان.

٥-سوپای (عەمری کوڕی عاص) چوو بەرەو باکور بۆ عەشیرەتەکانی قضاعة و ودیعة و الحارث.

٦-سوپای (خالد کوڕی سەعید) چوو بەرەو شام.

٧-سوپای (عەلائی کوڕی حەضرەمی) چوو بەرەو بەحرەین لە کاتێکدا کە الحطم کوڕی ضبیعة کە لە هەڵگەڕاوەکانی عبدولقەیس و عەشیرەتی رەبیعەیە لەوێ بوو.

٨-سوپای (حوزەیفەی کوڕی موحصن) چوو بەرەو ناوچەی دبا بعمان.

٩-سوپای (عەرفەجەی کوڕی هەرثەمە) چوو بەرەو خەڵکی مەهرە.

١٠-سوپای (موهاجیر کوڕی ئومەییە) چوو بەرەو صنعاء لە یەمەن لە کاتێکدا ئەسوەدی عەنسی لەوێ بوو پاشان چوو بۆ حضرموت.

١١-سوپای (سوید کوڕی موقرین) چوو بەرەو تیهامە لە یەمەن.

هەموو ئەم سوپایانە سەرکەوتنیان بەدەست هێنا بە لەناوبردن و کۆتای پێ هێنانی بزوتنەوەی هەڵگەڕاوەکان...

خالیدی کوڕی وەلید بە سوپایەکی دە هەزار موجاهیدەوە بەرەو طلیحەی کوڕی خوەیلد دەرچوو، کە سوپاکەی طلیحە لە چل هەزار کەس پیکهاتبوو، کەوتنە شەڕ لەگەڵ یەك کە جەنگەکە ناوی (بزاخة) بوو، لە ناوچەی (ماء لطيء یان بەنی ئەسەد لە زەوی نەجد) سوپاکەی طلیحە شکستی خواردو خۆی رایکرد، پاشان لە دوایدا تۆبەی کرد و لە شەری نەهاوەندا شەهید بوو!!

خراپترین و دژوارترین جەنگ کە هاوەڵانی تێکەوتبێت جەنگی یەمامەیە، سەرکردەی ئەم جەنگە عیکرەمەی کوڕی ئەبوجەهل بوو، ئەبوبەکر فەرمانی کرد بە عیکریمە کە لەگەڵ سوپای شەرحبیل یەك بگرن بەڵام عیکریمە ئەو فەرمانەی جێبەجێ نەکرد هەر بۆیە لە جەنگەکەدا شکا، بەڵام خالیدی کوری وەلید توانی خۆی بگەیەنێتە لایان بە سوپاکەیەوە و سەرکەوتنی بۆ موسوڵمانان بەدەست هێنا، ژمارەی کوژراوانی مورتەد بووەکان بیست هەزار کەس بوون لە ناویاندا موسەیلەمەی درۆزنیشی تیدابوو، وە ژمارەی شەهیدانی موسوڵمانان هەزارو دووسەد هاوەڵ بوون چوارسەد

هاوەڵیـان لـە موهـاجیرو ئەنصـارەکان بـون کـە قورئانیـان لـە سـنگیاندا هـەڵگرتبوو، ئەمـەش گـەورەترین ناڕەحـەتی بـوو کـە بەسـەر هـاوەڵانی پێغەمبـەردا (صَلَّى الله عَلَيْـهِ وَسَلَّمَ) هات.

**لەجەنگی یەمامەدا کۆمەڵێ هەڵوێست و ئازایەتی هەیە، کە پێویستە وەك بیرهێنانەوەیەك لێرەدا باسیان بکەین:**

❖ هاوەڵانی پێغەمبەر (صَلَّى الله عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بۆ جێگیرکردن و هاندانی یەکتری لەسەر جیهاد و جەنگ، هاواریان لەیەکتری دەکرد ئەی هاوەڵانی بەقەرە مەبەستیان لە سورەتی(البقرة)یە.

❖ ثابتی کوڕی قەیس چاڵێکی هەڵکەندبوو کە قاچەکانی تێدا نقوم کردبوو هەتا ئەژنۆی، کە هەڵگری ئاڵای ئەنصار بوو لەو ڕۆژەدا، دواتر هەر لەوێدا مایەوەو جێگیر بوو هەتا شەهید بوو ڕەحمەتی خوای گەورە لە ثابت بێت.

❖ کۆچەرەکان بە سالمی غولامی ئەبو حوزەیفەیان وت: ئایا قەت بووە بەقەد ئەو ڕۆژە ترسابێتی؟ فەرموی: لە دوای ئەوەی بومە هەڵگری قورئان لە سینەمدا لەچی بترسم.

❖ هەر ئەبو حوزەیفە بۆخۆی بیری هاوەڵانی دەهێنایەوە لە جەنگەکەدا دەیفەرموو: (ئەی ئەهلی قورئان، قورئان بڕازێنەوە بە کردەوەو غیرەتان لەم ڕۆژەدا) بەم شێوەیە بەردەوام بوو هەتا بریندار بوو، ڕەحمەتی خوای گەورە لە ئەبو حوزەیفە.

❖ یەکێکیتر لەو دیمەنانەی لەم جەنگەدا جێگەی سەرنج بوو، ئەوە بوو هەڵگەڕاوەکان باخچەیەکیان دەست بەسەردا گرتبوو ناونرابوو باخچەی مردن،

چونکە هەرچی کەسێك لەو شەڕەدا دەچووە باخچەکە توشی شەڕێکی سەخت دەبوو، بەرائی کوڕی مالیك یەکێك بوو لە سەربازانی موسوڵمانان، هاواری کرد ئەی کۆمەڵی موسوڵمانان بمگەیەنن بە باخچەکە، هەڵیانگرت لەسەر قەدی رمەکان و بەرزیان کردەوە هەتا گەیشتە سەر دیواری باخچەکە، لەوێوە خۆی هەڵدایە ناو باخچەکەو خۆی گەیاندە دەرگای باخچەکەو کردیەوە، لەکاتێکدا چەندین کەس لەدەوری دەرگاکە بوون و هەموشی لە ئامادەبەشیدا بوون بۆ شەڕ!.

❖ لەو شەڕەدا خالیدی کوڕی وەلید نۆ شمشێر بەدەستیەوە شکاوە!!.

❖ یەکێکیتر لەو دیمەنە سەرنج راکێشانەی جەنگەکە ئەوە بوو ئەبو حوزەیفەی بەنی رەبیعە، و عباد بەنی بەشر، هەردوکیان لە ڕۆژی یەمامەدا شەهیدکران و پێغەمبەر (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بۆخۆی کردبونی بە برای یەکتری.

❖ یەکێکیتر لەو دیمەنانە ئەوە بوو کە سەرکردەی رەبانی عەلاء کوڕی حەضرەمی سوپاکەی کردە ناو دەریاوە بە بێ ئەوەی بترسێ.

ئەبو هورەیرە کە خۆی بەشداری کردبوو لەو سوپایەدا دەفەرموێت: (لەوکاتەی سوپای هەڵگەڕاوەکان هەڵهاتن بەرەو دەریا و کەشتیان دەستکەوت، ئێمە پێمان وانەبوو کە ئەوان کەشتیان هەبێت، عەلائی کوڕی حەضرەمی دۆعای کردو داوای لە خوای گەورە کردو فەرموی: « يا أرحم الراحمين، يا حكيم يا كريم، يا أحد يا صمد، يا حي يا محي، يا قيوم يا ذالجلال و الكرام، لا إله إلا أنت، يا ربنا أجزنا من هذا البحر». کەئەم دۆعایەی خوێند عەلائی حەضرەمی فەرمانی کرد بە سوپاکە کە بەرێبکەون بە ئاوەکەدا، ئێمەش بە ئاوەکەدا ڕۆیشتین سوێند بەخوا هەستمان نەکردوە کە پێکانمان توشی نوقم بون بوبێت) .

ئابەم شێوەیە ئەم جەنگە بەردەوام بوو هەتا ساڵی یانزەی کۆچی، هاوەڵانی پێغەمبەر صَلَّى الله عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بەشێوەی یانزە سوپا بەتەواوی خۆیان تەرخان کردبوو بۆ ئەم جەنگە، وە هەریەک لە ئەبوبەکرو عومەر و عەلی کوڕی ئەبوتاڵیب سەرپرشتی جەنگەکەیان دەکرد، وە ئەهلی راوێژکارانی خەلیفەش بە بەردەوامی بەشداربوون بەبێ ئەوەی توشی هیلاکەت و مەلەل ببن لەپێناو پاراستنی دینی پاکی ئیسلام، رەحمەتی خوای گەورە برژێ بەسەر هەر هەمویاندا...

**دەستپێکی ساڵی دوانزەی کۆچی:** شوێنەواری جەنگی مەڵگەڕاوەکان هێشتا مابوو بەتایبەت ئەوەی لە یەمامەدا ڕویدا، کە بووە هۆی شەهیدبونی ژمارەیەکی زۆر لە و هاوەڵانەی قورئانی پیرۆزیان لە سنگیاندا لەبەر کردبوو، بۆیە ئیمامی عومەر کەوتە دودڵیەوە، چونکە قورئان هەتا ئەوکاتەش لە ناو هاوەڵاندا جیاکاری تێدا هەبوو، هەندێکیان لەبەریان کردبوو بەڵام نەیان نوسیبۆوە، وەهەندێکیتریان کە پێغەمبەر صَلَّى الله عَلَيْهِ وَسَلَّمَ تایبەتی کردبوون بە نوسینەوەی وەحی، بەڵام هەتا ئەوکاتە کۆنەکرابۆوە لەلای یەک کەس بەڵکو بەش بەش بوون، کەسیش ئەوەی نەکردبوو کە هەمووی کۆبکاتەوە بەتەواوی لەیەک شوێندا، هەربۆیە ئیمامی عومەر ئەم دوودڵیەی خۆی باسکرد بۆ خەلیفەی مسوڵمانان ئەبوبەکری صدیق.

## کۆکردنەوەی قورئان لەسەردەمی ئەبوبەکردا:

بوخاری چیرۆکێکمان بۆ دەگێڕێتەوە لە زەیدی کوڕی سابتەوە کە دەفەرموێ:

((دوابەدوای جەنگی یەمامە ئەبوبەکر ناردی بەشوێنمدا، عومەریش لە لای بوو، ئەبوبەکر پێی وتم: عومەر هاتۆتە لام و پێی وتووم: جەنگی یەمامە زۆر گەرم بووە و قورئان لەبەرەکانی هەموو لەناوبرد، من دەترسم ئەوانەشیان کەماون لە جەنگەکانی تردا تیابچن، زۆرێک لە ئایەتەکانی قورئان ون ببن وبفەوتێن، من لەبەر ئەم هۆیە دەبینم، کە چاکتروایە هەستین بە کۆکردنەوەی قورئانی پیرۆز.

منیش بە عومەرم وت: چۆن دەبێت شتێک بکەین کە پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ نەیکردووە ؟! عومەریش وتی: وەاللە کارێکی خێری زۆر گەورەیە، ئیتر عومەر کۆڵی لێ نەدام و هەر ئەو داوایەی لێ دەکردم تا ئەوەبوو خوای گەورە دڵی منیشی بۆ ئەو کارە کردەوە.

زەید دەڵێت: عومەر لە تەنیشت ئەبوبەکرەوە دانیشتبوو هیچی نەدەوت، ئەبوبەکر پێی وتم: تۆ پیاوێکی گەنجیت و خاوەنی ژیریت، هیچ شتێکمان لەسەرت نیە، تۆ کاتی خۆی کە قورئان دەهاتە خوارەوە دەتنووسییەوە، بڕۆ بەدوای قورئاندا هەمووی کۆبکەرەوە.

زەید دەڵێت: سوێند بەخوا بیانووتایە چیایەک بگوێزەرەوە لە جێیەک بۆ جێیەکی تر ئاسانتربوو لەلام لەو ئەرکەی دایان بەسەرمدا کە کۆکردنەوەی قورئان بوو، پێم وت بە ئەبوبەکر چۆن کارێک دەکەن کە پێغەمبەر صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ نەیکردووە!!

ئەبـوبەکر وتـی: وەاللە مـن وادەزانـم ئەمە خێرێکی زۆر گەورەیە، جـا زەیـد دەفەرمـوێ: منیش زۆر دڵم لەسـەر ئەم کارە جێگیر نەبوو هەتا خوای گەورەش دڵی منیشی کردەوە بـۆ ئەم کارە هەروەک کە دڵی ئەبـوبەکرو عـومەری کـردەوە، زەیـد چیکـرد بـۆ ئەم کارەی درابوو پێی؟

بە پشـت بەسـتن بەو هـاوەڵانەی پێغەمـبەر صَلَّى اللهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ کە قـورئانیـان لەبەر بوو، وە دانانی پلانێکی زۆر تۆکمەو ورد بۆ کۆکردنەوەی قـورئان.

زەیـد بەتەنیـا پشـتی نەبەسـت بـوو بە ئەو کەسـانەی کە قـورئانیـان لەبەربـوو، بەڵکـوو پشـتی بەسـتبووش بە ئەو پـارچە ماددیـانەی کە قـورئـانی تێـدا نوسـرابۆوەو هەڵگیرابـوو، نەک بە تەنها ئەوەی لە دڵدا هەڵگیرابوون.

بۆ ئەم کارەشی دوو مەرجی دانە:

**مەرجی یەکەم:** دەبێت ئەو ئایەتانە هاوەڵانی پێغەمبەر صَلَّى اللهُ عَلَيْـهِ وَسَلَّمَ لە بەریان بووبێت و وە لەخزمەت پێغەمبەری خواشـدا صَلَّى اللهُ عَلَيْـهِ وَسَلَّمَ نوسـرابوبێتەوە، بەو شێوەیەی کە جەنابی بۆی خوێندونەتەوە.

**مەرجی دووەم:** هەرکەسـێک ئـایەتێکی لەبەربـوایە، لێی وەرنەدەگـرت تـا دوو شـایەتی نەبـووایە کە ئەو ئـایەتە لە حـزووری پێغەمـبەری خـوادا نووسـراوەتەوە، دەبـوایە یەکێکیش بوایە لەو شێوازانەی قورئانی پێ هاتۆتە خوارەوە.

لەسـەر ئەم شـێوازە زەیـد بەردەوام بـوو، ئـایەت ئـایەت کۆی دەکـردەوە کە لەسـەر پەلی دارخورماو تـوێکڵی دارو پێسـتەی حەیوان و وە سـنگی هاوەڵان کە قورئانەکەیان لەبەر

بــوو هەڵگیرابــوو... بەڵام ئایەتێـک کە دووشــاهیدی نەبــوو لەســەردەمی پێغەمـبەردا نووسـرابێتەوە، بەڵکو یەک شـاهیدی هەبوو ئەویش خوزەیمەی کوڕی ثابتی ئەنصاری بـوو، ئەویـش پێغەمـبەر صَلَّى الله عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ پێی وتبـوو وەک ڕێزلێنانێـک لە ئەو کە شایەتی تۆ بە دوو شایەت حسابە، بەمەش ئەو ئایەتەش مەرجەکان شمولی کرد.

ئەم کارەی زەیـد پـێ هەڵسـا هەرگیز کەس بەم شـێوەیە نەی نووسـیوە، خەڵکی لەنـاو خۆیاندا دەیان وتەوەو دەیان خوێندەوە بەشێوەی موتەواتر بە نوسراوی هەبووە وە بە شێوەی متەواتریش لە سنگی ماوەڵاندا هەبووە، هیچ کتێبێک نیە لەم دونیایەدا بەم شـێوەیە نوسـرابێتەوە بـێجگەلە قورئـان، خـوای گەورە بـۆ خـۆی قورئـان دەپـارێزێ و هەرخۆشـی دەفەرمـوێ: ﴿إِنَّا نَحْنُ نَزَّلْنَا الذِّكْرَ وَإِنَّا لَهُ لَحَافِظُونَ ۝٩﴾ الحجـــر: ٩بەڵام پاراستنەکە لەسەر دەستی ئەو کەسانە دەبێت کە دەژین لە پێناو ئیسلامدا، وەپێوەی سـەرقاڵ دەبن هەمـوو کات و سـاتێکی ژیانیـان، ئەمەش کۆکردنەوەی یەکەمی قورئانە سـوپاس و سـتیاش بـۆ خـوای گەورە بـۆ ئەو نـیعمەتە گەورەیەی پێی بەخشـیوین کە قورئانە.

## سەرەتای سەردەمی فتوحات

## دەستپێکی فتوحاتەکانی عێراق و وڵاتی فارس

جەنگی هەڵگەڕاوەکان کۆتای پێهات، وە لەگەڵیدا کۆتای هات بە هەموو هەڵگەڕانەوەیەک بەشێوازو جۆرەکانیەوە، جەزیرەی عەرەبی جێگیربونی بەخۆوە بینی، دینی حەنیفی پاک و ڕاست گەڕایەوە، هەربۆیە ئەبوبەکر ڕێگەیدا بە دەستپێکردنی فتوحاتەکان، بەعێراق دەستیپێکرد ئەویش بە دروستکردنی دوو سوپا:

**سوپای یەکەم:** بەسەرکردایەتی خالیدی کوڕی وەلید، لەوکاتەدا لە یەمامەبوو، ئەبوبەکر فەرمانی بۆ نارد کە فەتحی عێراق بکات لە باشوری خۆرئاواوە، سەرەتا لە ناوچەی (أبلة)ەوە دەستپێبکە هەتا دەگات عێراق لەبەشی سەرەوە .

**سوپای دووەم:** بەسەرکردایەتی عیاضی کوڕی غەنەم، لەوکاتەدا لە ناوچەیەک بوو بەناوی (النباج) کە لەنێوانی ڕێگای مەککەو بەصرەدایە، ئەبوبەکر فەرمانی بۆ نارد کە فەتحی عێراق بکات لە باکوری ڕۆژهەڵاتەوە دەستپێبکات لە ناوچەی (المصیخ) ەوە، وە ئەبوبەکر وتی: بڕۆن هەتا دەگەنە (المصیخ) لەوێوە دەستپێبکەن، پاشان بچنە ناو عێراقەوە لە بەشی سەرەوەی هەتا دەگەن بە خالید، ئیتر لەوێدا سوپاکەتان ڕێگەپێدراوە کە بگەڕێتەوە، زۆر لەکەس مەکەن بۆ ئەوەی بەردەوام بێت، هەرکەس ویستی بەردەوام بێت لە سوپاکە ئەوا بابەردەوام بێت وە هەرکەسیش ویستی بگەڕێتەوە ئەوەش ویستی خۆیەتی.

ئەبوبەکر نامەیەکی نارد بۆ هەردوو سەرکردەکە خالد کوڕی وەلید و عیاضی کوڕی غەنەم، نووسی بۆیان: هەردووکتان بەرەو حیرە بکشێن و هەرکامتان زوو گەیشتنە ئەوێ، ئەوە دەبێتە ئەمیر بەسەر ئەوی ترەوە، ئەگەر لە حیرە گەیشتن بەیەک، دەستان خاڵی بوو لە چەکدارە فارسەکان دڵنیابون لەوەی کە لە دواوە لە سوپای موسوڵمانان نادرێت، با یەکێکتان لە دواوە سوپای موسوڵمانەکان بپارێزێت و ئاگای لە سوپاکەی هاوڕێکەی بێت لە حیرە، با ئەوی ترتان هەڵکوتێتە سەر دوژمنانی خوا، کە فارسەکانن و لە سەرکردایەتیان بدات کە ( مەدائن)ە.

وەهەروەها ئەبوبەکر فەرمانی ئەوەشی پێکردن کە خۆیان بگونجێنن لەگەڵ خەڵکەکەو نەرم بن لەگەڵیاندا، بانگیان بکەن بۆ ڕێگای ئیمان و باوەڕ، ئەگەر بە قسەیان کردن باشە وەگەرنا سەرانەیان لەسەر دابنێن، ئەگەر ئەوەشیان نەدا جەنگیان لەگەڵدا بکەن، وە پێشی وتن کە کۆمەکی نەوێت لەو کەسانەی لە ئیسلام پاشگەزبوونەتەوە ئیتر با موسوڵمانیش بووبێتەوە.

ئەبوبەکر فەرمانی کرد بە موسەنای کوڕی حارث کە پەیوەندی بکە بە سوپاکەی خالیدەوە، ئەم نامەیەشی بۆنارد:

((پاشان ئەوا خالیدی کوڕی وەلیدم نارد بۆ لاتان بۆ عێراق جا خۆت و هۆزەکەت پێشوازی لێبکەن، پاشان هاوکاری بکەو پشتی بگرە و باڵی ڕاستی بە، لەقسەی دەرمەچۆ و پێچەوانەی بۆچونەکانی مەکە، چونکە یەکێکە لەو کەسانەی کە خوای گەورە دەربارەیان دەفەرموێ:

﴿ مُّحَمَّدٌ رَّسُولُ ٱللَّهِۚ وَٱلَّذِينَ مَعَهُۥٓ أَشِدَّآءُ عَلَى ٱلۡكُفَّارِ رُحَمَآءُ بَيۡنَهُمۡۖ تَرَىٰهُمۡ رُكَّعٗا سُجَّدٗا ﴾ الفتح: ٢٩

واتە: ﷴ پێغەمبەری خوایەو ئەوانەشی لەگەڵیدان بەرامبەر بێ باوەڕان توندو تیژن و بەرامبەر باوەڕداران نەرم و نیان و بە سۆزن، هەتا لەوێ بێت ئەو ئەمیرە و ئەگەر لەوێ نەما تۆ هەر ئەمیرەکەی جارانیت)).

مێژووی ناردنی خالید بۆ عێراق لە مانگی ڕەجەب ساڵی ١١ کۆچیدابوو، هەندێکیتر دەڵێن لە مانگی موحەرەم ساڵی ١٢ کۆچیدابووە، سوپاکەی خالید لە هەژدە هەزار جەنگاوەر پێک هاتبوو، توانی یانزە جەنگ بکات وە سەرکەوتن بەدەست بهێنێت لەهەموو جەنگەکاندا ئەوەش فەزڵی خوای گەورەیە.

## جەنگەکانی خالیدی کوڕی وەلید لە عێراق:

**١-جەنگی (ذات السلاسل):**

سەرەتا خالید کوڕی وەلید دەرچوو بەرەو ناوچەی( الأبلة)، نامەیەکی نارد بۆ هورمز کە حاکمی ناوچەی (الأبلة) بوو پێی وت: موسوڵمان ببە بێوەی دەبیت، یان خۆت و قەومەکەت قبوڵی جزیە بکەن، ئەگەر ئەوەش نەکەن ئەوا لۆمەی خۆتان بکەن، چونکە گەلێکم هێناوەتە سەرتان ئێوە چەندە حەزتان لە ژیانە ئەوان ئەوەندە حەزیان لە مردنە.

خالید سوپاکەی دابەشکرد بۆ سێ بەشەوە، بەشی پێشەوەیدا بە (موسەنای کوڕی حارث) بەدوایدا بەشی دووەمیدا بە (عەدی کوڕی حاتم الطائی) بەشی سێیەمیش بەدوایدا بۆخۆی سەرکردایەتی کرد، وە فەرمانی کرد کە هەریەکەیان بەڕێگەیکی جیاواز لەوەی تردا بڕوات و پاشان لەیەک شوێن یەک بگرنەوە.

کاتێک هورمز بەوەی زانی کە خالید بەڕێ کەوتووە، وە زانی کە خالید و سوپاکەی گەیشتونەتە (الحضیر) پێش ئەوان خۆی گەیاندە ئەوێ، هورمز سوپاکەی کردە دووبەشەوە، سوپای موسوڵمانان سەرکەوتن بەسەر کافراندا بە فەزڵی خوای گەورە، خالیدی کوڕی وەلید توانی هورمزی سەرکردەی فارسەکان بکوژێ کە هورمز ویستی خالید بکوژێ بە ناپاکیکردن لێی، بەڵام قەعقەعی کوڕی عەمر توانی فێڵ و ناپاکی هورمز ئاشکرابکات و خالید رزگاربکات.

هــۆی ناونــانی ئەم جەنــگە بە (ذات السلاســل) واتە: خــاوەن زنجیرەکــان، بــۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە فارسەکان بەزنجیر خۆیان بەستبوویەوە تا ڕانەکەن بەڵام ئەم کارەیان دادی نەدان لەبەردەم شمشێرە نەبەردەکاندا.

## ٢-جەنگی المذار (الثني):

ئەم جەنگە لە مانگی سەفەر ساڵی ١٢ کۆچیدا بوو، هۆکارەکەی ئەوەبوو کە هورمز کیسرای ئاگادار کردەوە لەو نامەیەی کە خالید بۆ هورمزی ناردبوو، هورمزیش داوای هاوکاری کرد لە کیسرا هەتا لە بەرەنگاربونەوەی خالیدا پشتیوانی بێت، کیسراش هاوکــاری گەیانــدە هــورمز بە ســەرکردایەتی (قــارن) بەڵام هــورمز پەلەی کــرد لە پەلەماردانی خالیداو چاوەڕێی هێزی قارنی نەکرد، ئەوە بوو کە سوپای هورمز بەرامبەر موسوڵمانان شکان و ڕایانکرد، لەڕێگا سوپای قارن و سوپا هەڵهاتوەکەی هورمز بەیەک گەیشتن.

کاتێک یەکیان گرت خۆیان ئامادەکرد و گەڕانەوە بۆ شەڕکردن دژی سوپای خالید، گەیشتنە ناوچەیەک کە پێی دەوترا (المذار) کاتێک گەیشتنە ئەوێ خالید بەمەی زانی و نامەی نارد بۆ ئەبوبەکر ئەوی لێ ئاگادار کردەوە، خالید بەڕێ کەوت بۆ ناوچەی المذار و پێشتریش سوپاکەی ئامادە کردبوو بۆ هەر پەلەمارێکی لەناکاو، هەردوو سوپاکە بەیەک گەیشــتن، جەنگێکــی زۆر قــورس و گەورە ڕویــدا لەنێوانیانــدا، ســەرکردەی فارسەکان کە ناوی قارن بوو دەرچووە دەرەوە و بانگی خالیدی کرد هەتا بێتە دەرەوەو شەڕی لەگەڵدا بکات، خالید بۆی چووە دەرەوە، بەڵام پێش ئەوەی خالید پێیبگات مەعقەلی کوڕی ئەعــمەش کوشــتی، قــارن لای ڕاســتی ســوپاکەی (قبــاذ)ی کردبــووە

سـەرکردەی وەلای چەپـیش (أنوشـجان)ی کردبـوو کە لەو کەسـانە پێـک هـاتبوون لەجەنگی ذات السلاسل بەشـداریان کردبوو وە هەڵهاتبون، موسـوڵمانان بەرامبەریان بـونەوە و کەوتـنە شـەڕکردن لەگەڵیـان، قبـاذ لە لایەن عاصـم کـوڕی عمـرو تەمیمی کوژرا، لە فەزڵی خـوای گەورەوە موسـوڵمانان سـەرکەوتن بەسـەر فارسـەکاندا و سی هەزار کەسیان لێ کوشتن، زۆریشیان لەرێگەی دەریاوە بەکەشتی هەڵهاتن، ژمارەیەکی زۆریشیان لێگیرا بە دیل لەوانە حبیب باوکی حەسەنی بەصری کە مەسیحی بوو.

**٣-جەنگی الولجـة:** کاتێـک کە هەواڵی شکسـتی سـوپای فـارس لە جەنگـی (المـذار) گەیشـتەوە بە کیسـرای فارس(ئەردەشـیر)، یەکێـک لە سـەرکردە بەناوبانگەکـان بە ئـازایەتی کە نـاوی (الأنـدزغر) بـوو نـارد بـۆ شـەڕی موسـوڵمانان، سـوپاکەی بەڕێکەوتـن هەتا گەیشـتنە نـاوچەیەک کە پێی دەوترێـت( الـولجـة) کاتێک خالیـد بەم هەواڵەی زانی کە فارسـەکان کۆبونەتەوەو دابەزیون لە ولجة، خالیـد دەسـتیکرد بە جـوڵانی سـوپاکەی هەتـا گەیشـت پێیـان، خالیـد هەسـتا بە دانـانی پلانێـک بـۆ ئەم جەنـگە ئەویـش دابەشـکردنی سـوپاکە بە سێ بەشـەوە، لە بەرەکانی دواوە سـویدی کـوڕی مـوقرمی دانـا لە (الحضیر)، کاتێکیش بەرەو فـارسـەکان وەسـتا پلانی دانا کە لە دواوەو لە هەردوولاوە پەلاماریـان بـدەن، جەنـگ دەسـتیپێکرد، جەنگێکی زۆر سـەخت و قـورس بـوو، خالیـد هێرشـێکی زۆر تونـدی کـرد لە بەشی پێشـەوە، لەلاتەنیشتەکانیشـەوە هێرشـیان کـردنە سـەریان، ئیتر سـوپای فـارس توشی تێکچـونی ریزەکانیـان بـوون و ترسـێکی زۆر زاڵ بـوو بەسەریاندا، توشی شکست بوون وە سەرکردەکەیان ئەندەر زەغر هەڵهات و لەڕێگا لە تونیەتیدا مرد، ژمارەیەکی زۆر لە فـارسـەکان کوژران، وە ژمارەیەکی زۆریشـیان لێ بەدیل گیرا، لە ڕیوایەتێکدا هـاتووە دەڵێن: خـالیـد لە جەنگی وەلجەدا ڕووبەڕووی پـاڵەوانێکی

فارس بۆتەوە کە هەزار کەس پێیان نەوێراوە بەڵام ئەو کوشتی، کاتێک لێ بوویەوە شانی لەسەر تەرمەکەی داناوەو داوای خواردنی لێکرد.

## ٤- جەنگی ألیس ڕزگارکردنی ئیمغیشیا:-

کاتێک خالیدی کوڕی وەلید زانی مەسیحیە عەرەبەکان لەگەڵ فارسەکان کۆبونەتەوە، مەسـیحیەکان بە سـەرکردایەتی (عبدالأسـود العجلـی)، وە فارسـەکانیش بە سـەرکردایەتی (جابـان)، جابـان داوای لە سـوپاکەی کـرد کە هێـرش بـکەنە سـەر موسـوڵمانان، بێ ئەوەی گرنگی بـدەن بە هێزو کەسـایەتی خالیـد، بـۆیە زۆر بـێخەم کەوتـنە دروسـتکردنی خـواردن بـۆ خۆیـان و سـوپاکەیان، بـۆیە خالیـد هەر زوو دەسـتیکرد بە هێرشـکردن بۆیـان، هێرشـێکی زۆر تونـدی کـردە سـەریان لە سـەرەتادا فارسەکان توانیـان بەرگەی هێرشـەکە بگرن، پاشـان هێزێکی تری گەورەیـان پێگەیشـت فارسـەکان لە لایەن بهمـن جـاذویە، موسـوڵمانەکان توانیـان بەرامـبەر ئەم هێرشـە خۆیـان زۆر بە باشی ڕابگـرن و شـەڕی خۆیـان دەکـرد، خالیـد وتـی: خـوایە لەم جەنـگە سـەختە سـەرکەوتومان بـکە دەبـێ ئەوەی مـایەوە هەمویـان بکـوژین کەسـیان لێ نەمێنێتەوە هەتا ڕوباری خوێن دروست دەبێت، خوای گەورە موسـوڵمانانی سەرخست بەسـەر کافرانی فارسـدا، خالیـدی هـاواری کـردوو وتـی: بیـانگرن ... بیـانگرن، مەگەر کەسێک نەیەوێ دیلی بکەن، موسوڵمانان هەموو دیلەکانیان کۆکردەوە لە شـوێنێکدا، خالیـد هەموویـانی کوشـت، ژمارەی کوژراوان لەم جەنگەدا نزیکی حەفتـا هەزار کەس دەبوو.

خالیدی کوڕی وەلید موژدەی سەرکەوتنی بە ئەبوبەکری صدیق ڕاگەیاند، خالیدیش ١\٥ دەستکەوتەکانی جەنگی بە پیاوێکدا ناردەوە کە ناوی جەندەل بوو لە بەنی عەجل بوو، کاتێک ئەبوبەکری صدیق ئەم هەواڵە خۆشەی بیست چووە سەرمیمبەرو وتی: ئەی قوڕەیشـــیەکان شـــێرەکەی ئێـــوە – خالیـــد- پەلامـــاری شـــێرەکەی ئەوانـــی داو گۆشتەکەی ئەنجن ئەنجن کرد، ئافرەتان نەیان توانیوە ڕۆڵەی وەک خالیدیان ببێت!

**٥- ڕزگارکردنی (حیرە):-**

مەرزبانی حیرە هەواڵی سەرکەوتنەکانی خالیدی لە ئیمغیشیا پێ گەیشت و دڵنیابوو کە سەرەی ئەویش دێت، خۆی بۆ سازکرد و سوپایەکی بە سەرکردایەتی کوڕەکەی خۆی نارد، پاشان دەرچووە دەرەوە چونکە پێی وابوو کە خالید بە ئاودا دێت بۆیان، بۆیە فەرمانی کرد پێیان کە ئاوی فورات بگرنەوە هەتا کەشتیەکانی خالید نەتوانن بێن بۆیان، پاشان سەربازەکانی بردە دەرەوەی حیرەو چاوەڕێی دەکرد خالید بێت.

خالید لەگەڵ چەند پیاوێک بەسواری کەشتی چون، دەرچون بۆ باکوری حیرە، کەشتیەکان لە ئاوەکەدا وەستان و نەڕۆیشتن بۆیە خالید زۆر توڕەبوو، دەرچوو بۆ کوڕەکەی مەرزەبان، کتوپڕ گەیشت پێیان لەناو چەند سوارێکدا بوو هەموویانی کوشت، پێش ئەوەی هەواڵبگات بە مەرزەبان کە کوڕەکەی کوژراوە، خالید چووە سەر ئاوەکەو ئاوی فوراتی بەردایەوە بۆ شوێنی خۆی، کاتێک بەمەیان زانی بەبێ شەڕکردن هەڵهاتن و ناوچەکەیان بەجێهێشت، خالید لەوێ سوپاکەی جێگیر کرد، خالید و کۆمەڵێک لە پیاوەکانی چون بۆ (النجف) پاشان لەنزیک قەڵاکەیان کە سپی بوو

وەستان، خەڵکی حیرە خۆیان لەناو قەڵاکاندا جێگیرکردبوو، خالیدیش بۆ هەر قەڵایەک پیاوێکی کردە سەرکردەی کۆمەڵێک و گەمارۆی قەڵاکانیاندا بەم شێوەیە:-

١-(ضرار بن الازور) بۆ گەمارۆی کۆشکی سپی کە ئیساسی کوڕی قوبەیسەی طائی تێدابوو.

٢-(ضرار بن الخطاب) بۆ گەمارۆی کۆشکی عەدەسیین کە عەدی کوڕی عەدی عوبادی تێدابوو.

٣-(ضرار بن مقرن) بۆ گەمارۆدانی کۆشکی بەنی مازن کە ئیبن ئاکالی تێدابوو.

٤-(مثنى بن حارثة) بۆ گەمارۆدانی کۆشکی ئیبن بەقیلە کە عەمری کوڕی عبدالمسیحی تێدابوو.

خالیدی کوڕی وەلید بەهەموو فەرماندەکانی خۆی وتبوو کە پێش هەموو شتێک بانگیان بکەن بۆ لای ئیسلام، ئەگەر قبووڵیانکرد لێیان وەربگرن، ئەگەر واشیان نەکرد ڕۆژێک مۆڵەتیان بدەن پاشان جەنگیان لەگەڵ بکەن.

ئەوان جەنگیان هەڵبژارد، بەردبارانی موسوڵمانانیان کرد، موسوڵمانانیش تیربارانیان کردن و هێرشیان بۆکردن، خەڵکەکە خۆیاندا بەدەستەوەو داوای چاوپێکەوتنی خالیدیان کرد، خالیدیش لەگەڵیان کۆبۆوە و ڕێکەوت لەگەڵیاندا لە بەرامبەر پێدانی

جـزيه به موسـوڵمانان، به بـڕی سـەد و نەوەد هەزار درهەم ڕێکەوتـن، خالیـد فەتحی ڕاگەیاندو دیاریەکانیشی نارد بۆ ئەبوبەکر[1].

**"گەورەیی و نەرم و نیانی ڕەوشتی موسوڵمانان":** دیاریەکان گەیشت بە ئەبوبەکری صدیق خەلیفەی موسوڵمانان و قبوڵیکرد، بەڵام بەشێک لەو جزیەی کە هاتبوو جیایکردەوە و گەڕانیەوە بۆ خەڵکی هەژاری حیرە لەکاتێکدا لەڕوی شەرعەوە دروستە هەمووی وەربگرن، چونکە پەیمان نامەیان لەگەڵدا کردبون، ئەمەش بۆ لەناوبردنی ئەو کەلتورە بوو کە لەوکاتەدا سەرکردە هەموو شتەکانی بۆخۆی هەڵدەگرت، بەم کارە ئەبوبەکر ئەو ڕێچکەیەی شکاند و بەشێک لەو سامانەی گەڕاندەوە بۆ خەڵکەکە!!.

خالید نامەیەکی بۆ ئەبوبەکر نارد و تیایدا نووسی: ((بسم الله الرحمن الرحيم: ئەمە بەڵێنامەی خالیدی کوڕی وەلیدە لەگەڵ عەمرای کوڕی عەدی و عەمری کوڕی عەبدولمەسیح، وە ئیاسی کوڕی قەبیصە، وە حیرەی کوڕی ئەکال، ئەمانە لە پیاو ماقوڵانی خەڵکی حیرەن، خەڵکی حیرە ڕازی بوون کە ئەمانە نوێنەرو گەورەیان بن، بەڵێن نامەمان لەگەڵ کردون بە بڕی سەد و نەوەد هەزار درهەم، قبوڵیان کردووە کە هەموو ساڵێک ئەو بڕەبدەن، ئەمەش بۆ ئەو کەسانەیە کە لە دونیادا دەژین بە ڕوهبان و قەسیسەکانیشیانەوە، بەڵام ئەو کەسانە ناگرێتەوە کە تەرکی دونیایان کردووە و چونەتە خەڵوەتەوە و دور لە خەڵکی دەژین[2]، بەڵام ئەگەر خۆیان ویستیان

---

[1] مەبەست لە دیاریەکان ئەو جزیەیە کە لەو قەومەی وەرگرتووە

[2] لەناو مەسیحیەکان و هەندێک دینی تردا خەڵکانێک واز لە دونیا دێنن و تەنها خەریکی عیبادەتکردن دەبن، کە ئەمە لە ئیسلامدا دروست نیە.

بیدەن ئەوا کێشەنیە دەتوانن بیدەن هەتا ئەو کاتەی بیانەوێ، وە ئەگەر کەسێک فێڵ و خیانەتی کرد ئەوا ئەم مەرج و بەڵێنامەیە نایگرێتەوە.

بە فەتحکردنی حیرە ئەبوبەکر زیاتر ئومێدی پەیداکرد بۆ فەتحکردنی هەموو عێراق، بەمەش دەبێتە زەنگێکی ترسناک بۆ فەرسەکان، چونکە عێراق شوێنێکی ستراتیجی بوو بە نیسبەت فارسەکانەوەو هەتا وەک ناوەخنی فارسەکان وابوو، خالیدی کوڕی وەلید ئەم ئەرکە گەورەیەی زۆر بە چاکی ئەنجامدا، لەکاتی خۆیدا توانی حیرە کۆنترۆڵبکات، سەرەتای جەنگەکە لە مانگی موحەرەمدا لە ١٢ هیجریدا دەستیپێکرد، لە مانگی رەبیعول ئەوەلدا لەهەمان ساڵدا خالیدی کوڕی وەلید توانی هەموو حیرە فەتحبکات، توانی لەماوەی سێ مانگ یان کەمتر ئەم ئەرکە گەورەیە ڕاپەڕێنێ، خالیدی کوڕی وەلید نمونەی ئازایەتی و جوامێریە لە مێژووی ئیسلامدا.

**٦- رزگارکردنی ئەنبار "ذات العیون":**

لەدوای کۆتای پێهێنان بە حیرە، خالیدی کوڕی وەلید بنکەیەکی سەربازی لەوێ دانا، ئەمەش بۆ ئەوەی ئەو ناوچەیە ئارامی خۆی وەربگرێت، وە دڵنیاش بێت لە پاراستنی پشتەوەی موسوڵمانان، قەعقاعی کوڕی عەمری تەمیمی کرد بە سەرکردەی حیرە، هەروەها ئەبوبەکری خەلیفەی موسوڵمانان عەیاضی کوڕی غەنەمی نارد بوو پێشتر بۆ بەری باکوری عێراق و خالیدیش بۆ هاوکاری کردنی ئەو بەڕێکەوت بۆ ئەو ناوچەیە هەتا هاوکاری بکات لە فەتحکردنی ئەو ناوچانەدا.

خالید گەیشتە ئەنبار، کاتێک گەیشت و بینی کە خەڵکی ئەو شوێنە خۆیان ئامادەکردووەو خەندەقیان لێداوە و هەموو رێگەیەکیان بۆ پاراستنی خۆیان گرتۆتەبەر، موسوڵمانان چوار دەوریان گرتن، خالیدی کوڕی وەلید فەرمانی کرد بە

سەربازەکانی کە بکەونە کوشتنی ئەو جاسوسانەی لەو ناوچانە بون لە خەڵکی ئەنبار، لەکاتی جەنگدا لەگەڵیان هەزار جاسوس لەو ناوەدا کوژرا بۆیە ئەو جەنگەش ناونراوە (ذات العیوان).

خالید بەژیرانەی سەربازی خۆی توانی ئەو خەندەقانە ببەزێنێت، بۆ ئەم کارە هات هەموو حوشترە لاوازەکانی هێناو سەریبڕین و فڕێی دانە ناو چاڵەکانەوە و هەتا بتوانن بەسەر لاشەکاندا بچنە ناو چاڵەکانەوە و دەستیانکرد بە شمشێربازی لەگەڵ فارسەکاندا و فارسەکانیان ناچار کرد پاشەکشە بکەن بۆ ناو قەڵاکان.

لە ئاکامدا سەرکردەی فارسەکان شیرازی ناو بوو، ناچار بوو رێکبکەوێت و بە مەرجەکانی خالید رازبێت، وە داواشیکرد کە رێگەی بدەن لەگەڵ چەند سوارێکدا بە بێوەی لە ئەنبار دەربچن، خالیدیش ئەوەی لێ قبوڵکرد بەمەرجێک هیچ ماڵ و سامانێک لەگەڵ خۆی نەبات.

**٧-جەنگی (عین التمر) :**

خالیدی کوڕی وەلید زوبرقانی کوڕی بەدری کردە سەرکردەی ئەنبار، پاشان خۆی بەڕێکەوت بەرەو (عین التمر)، کاتێک خالید و سوپاکەی گەیشتن کۆمەڵێکی زۆر لە قەبیلە عەرەبەکان کۆبووبوونەوە وەک (التمر، تغلب، إیاد) بەسەرکردایەتی (عقەی کوڕی ئەبی عقە)، بووبوونە پشتیوانی "مەهران" کە سەرکردەی فارسەکان بوو، عقەی کوڕی ئەبی عقە داوای کرد لە مەهران کە شەڕەکە وازلێبێنێ بۆ ئەمان، وە پێشی وت کە ئەوانە عەرەبن و ئێمەش عەرەبین و باشتر دەزانین کە چۆن شەڕیان لەگەڵ

بکەین، مەهران رازی بوو بەمە و وتی: ئەمە ئێوەو ئەوەش ئەوان، مەهران و سوپاکەی دورکەوتنەوەو چاودێری جەنگەکەیان دەکرد.

خالیـد و سـوپاکەی گەیشـتن بە عـقە، خالیـد بە سـوپاکەی وت کە هێرشـدەکەم و ئێوەش لەپشـتەوە بمپـارێزن، خالیـد هێرشـیکرد زۆر بە خێرایی و خـۆی گەیانـدە عـقە و باوەشی پێـداکرد و بەدیلی گرتی و بـاقی سوپاکەشی بەبێ شـەڕ ڕایـانکرد و زۆربەیـان لێ بەدیـل کـران، خالیـد بەرەو (عـین التمـر) بەڕێکەوت، کاتێـک مەهـران بەمەی زانـی کە عـقە و سـوپاکەی تێکشـکاون لەقەڵاکە دابەزی و بـۆی مەڵهـات، گـاورە عەرەبەکـان بینیـان وا دەرگـای قەڵاکە کـراوەتەوە خۆیانیـان پێـداکرد و لەوێ خۆیـان قـایم کـرد، خالیــدیش گەمــارۆی دان بە شــێوەیەکی زۆر تونــد، کاتێــک ئەوەیــان بینـی داوای ڕێکەوتنیان لێکرد، ئەویش وتی نایکەم بەمەرجێک نەبێت کە بە خاڵەکانی من رازی بن، ئەوانیش رازی بـوون و قەڵاکەیان دا بەدەستەوە و ئەویش فەرمانی دا عەقە بکوژرێت و دیلەکانی تریش لەنـاو ببرێن، پاشـان ژمارەیەکی زۆر دەسـتکەوتیان دەسـت کەوت، لە ناو کەنیسەی قەڵاکەدا نزیکی چل منداڵی تێدابوو کە ئینجیلیان پێ بوو وە دەرگاشـیان لەسـەر داخرابـوو، خالیـد دەرگـاکەی شـکاند و منداڵەکانیشـی دابەشـکرد بەسـەر سـەرکردەو دەنـگ خۆشـەکانی نـاو سـوپاکەی، لەو منـداڵانەش کە تیـادا بـوون وەک (حمـران) کە بـووە خزمەتکـاری عوسـمانی کـوڕی عەفـان، وە (سـیرین) کە بـاوکی محمدی کوڕی سیرین بوو ئەو کەڵە پیاوانەیان لێدەرچوو.

**٨- جەنگی (دومة الجندل) :**

ئەبوبەکری صدیق (وەلیدی کوڕی عقبە)ی نارد بۆ لای (عەیاضی کوڕی غەنەم) هەتا هاوکاری بکات لە فەتح کردنی (دومة الجندل)، بە گەیشتنی وەلید بۆ عێراق چووە پاڵ عەیاض و دەوری ئەو قەومەیانـدا، بەڵام هەروا مـانەوەو نەیـانتوانی هێـرش بـکەن بەدوای ڕێگایەکدا دەگەڕان، عەیاض بە وەلیدی وت: (هەندێک جار ڕاوێژکردن باشترو چاکترە لە سوپایەکی زۆر)، پێت وایە ئێمە چیبکەین لە ئێستادا؟

وەلیـد وەڵامی دایەوەو وتی: پێم باشـە کە نـامەیەک بـۆ خالیـدی کـوڕی وەلیـد بنوسـی، هەتا بێت و هاوکاریمان بکات بە خۆی و سوپاکەیەوە، عەیاض نامەی نارد بۆ خالید و داوای هاوکاری لێکـرد، کاتێـک نـامەکە بە خالیـد گەیشـت لە کۆتاییەکانی جەنگی (عین التمـر) دابـوو، خالیـد بەدەم داواکەی عەیاضـەوە چـوو، خـۆی و سـوپاکەی (عـین التمر)ییـان بەجێ هێشـت و بەڕێکەوتـن بـۆ (دومـة الجنـدل)، کاتێـک قەومـی (دومـة الجندل) هەواڵی هاتنی خالیدیان پێگەیشت ترسێکی زۆر لە دڵیاندا دروست بوو، بۆیە زۆر بە خێرای کەوتنە کۆکردنەوەی کۆمەڵێک لە قەومەکانی تـری دەوروپشـتیان وەک قەومی(بهراء، کلب، غسـان، تنوخ) هەتا هەموویـان پێکەوە هاوپەیمانیەکیان پێکهێنا، یەکێک لە سـەرکردەکانی (دومـة الجنـدل) کە نـاوی (ئەکیـدەر کـوڕی عەبـدول مەلیـک) بـوو، پێشـتر خالیـدی کوڕی وەلیـدی ناسـیبوو وە ناپاکی لە خالیـد کردبـوو، بـۆیە خالیـد ئەمجـارە خـۆی بـۆ حـازرکردبوو کە دەسـتی بـکەوێ بیکـوژێ، لەم جەنـگەدا ئەکیـدەری دەستکەوت و کوشتی و تۆڵەی ئەو ناپاکیانەی لێکردەوە کە کردبووی.

جەنگ دەستیپێکرد لەنێوان سوپای موسوڵمانەکان بە سەرکردایەتی خالیدی کوڕی وەلید و عەیاض، وە سوپای خەڵکی (دومة الجندل) بە سەرکردایەتی جودی کوڕی رەبیعەو ئیبن حەدرجان و ئیبن ئەبهەم، موسوڵمانەکان سەرکەوتن و ژمارەیەکی زۆریشیان لە کافرەکان کوشت، دەرگای (دومة الجندل) یان کردەوە، بە ڕزگارکردنی (دومة الجندل) موسوڵمانان بوونە خاوەنی شوێنێکی ستراتیژی گرنگی سەربازی، چونکە (دومة الجندل) کەوتبووە سەر سێ ڕایەک:

١-لە باشورەوە نیمچە دورگەی عەرەب.

٢-لە باکوری رۆژهەڵاتەوە عێراق.

٣- لە باکوری رۆژئاواوە شام.

لەبەر ئەم گرنگیەی بوو ئەبوبەکری صدیق زۆر پێداگری دەکرد لەسەر ئازادکردنی (دومة الجندل)، ئەگەر (دومة الجندل) ئازاد نەکرایە مەحاڵ بوو موسوڵمانان بتوانن بچنە دەرەوەی عێراق.

**٩-جەنگی الحصید:**

هۆزە عەرەبەکان کۆبونەوەو نامەیان بۆ فارسەکان نارد کە هاوکاریان بکەن بۆ ئەوەی تۆڵەی خۆیان لە خالید بکەنەوە لە بەرامبەر ئەو سەرکردە کوژراوەیان کە ناوی "عقە" بوو خالید کوشتبووی، (رزمهر) لە بەغدادەوە دەرچوو لەگەڵ (روزبة) دا چوون بۆ ئەنبار، هەتا گەیشتنە ناوچەکانی (الحصید و الخنافس)، سوپای موسوڵمانەکان و

فارسـەکان بەیەک گەیشـتن و جەنگێکی قـورس بەرپـابوو، (رزمهـر و روزبە) کـوژران و غەنیمە و دەستکەوتی باش دەستی موسوڵمانان کەوت.

ئەم جەنگە ناوێکی تریشی هەیە بەناوی (الخنافس).

**١٠-جەنگی المصیخ:**

کاتێـک کە هەواڵی موسـوڵمانان لە (الحصـید) گەیشـتەوە بە خالیـدی کـوڕی وەلیـد، سـەرکردەکانی سـوپاکەی کـۆکردەوەو لە شـەوێکدا لە کـاتی دیـاریکراودا لە نـاوچەی موصەییەخی نزیک حوران هەموویان گەیشتن بەیەک و پێکەوە دایان بەسـەر هەندێ هـۆزداو زیـانێکی گەورەیـان لێـدان، پاشـان خالیـد هەواڵی پێگەیشـت کە هەنـدێک لە هۆزەکان لە (مثنی) و (زمیل) لە دیار بکر کۆبونەتەوە بۆ جەنگکردن دژی موسوڵمانان، خالید بەشێوەیەکی کتوپڕ لە مثنی لەچەند ئاڕاستەیەکەوە دای بەسەریانداو پەرت و بڵاوی کردن، هەروەها هێرشی کرد بۆ ئەوانەی لە زمیل کۆبووبوونەوە و زیانێکی گەورەی پێگەیاندن.

**١١-جەنگی الفراض:**

بۆیەکەمین جار بوو کە موسوڵمانان توشی جەنگێک ببن کە بەرامبەرەکەیان بریتیبێت لە سـوپای فـارس(دەوڵەتی رۆژهەڵاتـی گەورە) و وە سـوپای رۆمەکان(دەوڵەتی رۆژئـاوای گەورە) وە عەرەبەکان کە پێک هـاتبوون لە هۆزەکانی(تغلب و إیاد و النمر)، هەمـوو ئـا ئەم سـوپا گەورانە کۆبووبـوونەوە دژی موسـوڵمانان، کاتێـک هەردووال گەیشـتنە ئـاوی فـورات بێباوەڕان بە موسوڵمانانیان وت: یان ئێوە وەرنە ئەمبەر بۆ ئێمە یان ئێمە دێینە ئەو بەر بۆتان.

خالیـد وتـی: نـا خۆمـانی لێنـادەین، بەڵام ئێـوە وەرنە خـواری ئـێمە، ئەمەش لە نیـوەی مانگی (ذي الحجة) ساڵی ١٢ کۆچیدابوو.

رۆم و فارسەکان لەناو خۆیاندا بە یەکیـان دەوت: دەسـەڵاتتان بپـارێزن، ئەمە پیـاوێکە لە پێنـاو ئاییـنـدا دەجەنگێـت، خـاوەنی ژیـری و زانیـاریە، وەڵاهی ئەو سـەردەکەوێت و ئێمەش دەشکێین، ئەم قسانەش سودی نەبوو بۆیـان هـاتنە ئەم بەروو چوونە خـوار خالیـد، کاتێـک بەتەواوی پەڕینەوە رۆمەکـان وتیـان: بەجیـا شـەڕبکەن تـا پـاک و پیـس لەیەک جیـابکرێتەوە و وە بشـزانین کە سـوپای موسـوڵمانان لە لای کێمـانەوە دێـتە ناومانەوە.

هەردوولا کەوتنە جەنگکردن و شەڕێکی زۆر گەورەو قورس ڕویدا لەنێوان موسوڵمانان و بێباوەڕانـدا، هەتـا خـوای گەورە سـەرکەوتنی نـارد بـۆ موسـوڵمانەکان، بەهەزاران کەسیان لێکوژرا، خالیـد بۆ ماوەی دە رۆژ لە (الفراض) مایەوەو پاشـان گەڕایەوە بۆ حیرە.

ئەم جەنگەش وەک کۆتا جەنگی خالید وایە کە لە عێراقدا ئەنجامیداوە.

## دەستپێکی جەنگەکانی شام (وڵاتی رۆم)

لە مانگی رەجەبی هەمان ساڵدا ئەبوبەکر چوار سوپای جیا جیای رێکخست و ناردنی بۆ شام کە ئەمانە بوون:

١-سوپایەک بە سەرکردایەتی یەزیدی کوڕی ئەبو سوفیان بۆ دیمەشق.

٢-سوپایەک بە سەرکردایەتی شەرحبیلی کوڕی حەسەنە بۆ ئوردون.

٣-سوپایەک بە سەرکردایەتی ئەبو عوبەیدەی کوڕی جەڕاح بۆ حمص.

٤-سوپایەک بە سەرکردایەتی عەمری کوڕی عاص بۆ فەلەستین.

بەڵام ئەم چوار سوپایە لە بەرەنگاربونەوەی ڕۆمەکاندا توشی نارەحەتیەکی زۆر بوون، ئا لەم کاتەدا ئەبوبەکر داوای لە خالیدی کوڕی وەلید کرد کە خۆی و سوپاکەی بچن بۆ شام، وە ئەبوبەکر وتی: (سوێند بەخوا بەناردنی خالید دەبێت والە ڕۆمەکان بکەین کە نەیان پەرژێتە خۆیان و سەرقاڵ بن بە وەس وەسەی شەیتانەوە)، ئەمەش لە مانگی سەفەری ساڵی ١٣ هیجریدا بوو.

"هەڵوێستەیەک": لەسەر سەربازێتی هاوەڵانی پێغەمبەر (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): عەمری کوڕی عاص زەکاتی هۆزی قەزاعەی کۆکردبووەوە... ئەبوبەکر نامەی بۆ نووسی کە خۆی حازربکات بۆ جەنگی وڵاتی شام:
پێی وت:( کە من سەرپشکت دەکەم لە نێوان بەردەوامیت لەسەر فەرماندێتی سوپاکەی پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) کە کاتی خۆی داینابویت، یان هەر کارێکیتر کە خۆت پێتخۆشەو خێری دونیاو ئاخیرەتی تیابێت بۆت)، عەمری کوڕی عاصیش نامەیەکی بۆ نوسیەوەو پێی وت: (من تیرێکم لە تیرەکانی ئیسلام و تۆش دوای خوا وەشێنەری ئەو تیرەیت، دەی سەیربکە کە کامیان بەهێزترو ترسناکترو چاکترە بۆم بموەشێنە!).
ئابەم شێوەیە ڕۆژەکانی ئەبوبەکر تێدەپەڕی، کە بەردەوام لە کارکردن و هەوڵدابوو بۆ سەرخستنی دینی ئیسلام، هەتا خوای گەورە قەدەری خۆی واهێنا کە ئومەتی ئەبوبەکری پاراست لە لەناوچون و بەهیلاک چون بەدەست خەڵکیەوە.

لەگەڵ ئەو پلەو پایانەی کە ئەبوبەکر پێی بەخشرابوو لە پێش بوون بە خەلیفەو دوای خەلیفایەتیش، ئەبوبەکر خۆی بە شایەنی ئەو پلەو ئاستە نەدەبینی لە کاتێکدا ئەرکەکانی خۆی بە باشترین شێوە رادەپەڕاند،

ئەگەر سەیری ئەو ریوایەتەبکەین کە بوخاری لەمێژووەکەیدا بۆمان دەگێڕێتەوە لە سوفیان و ئەویش لە عوبەیدە وە دەڵێ: ((عەینەی کوڕی حەصن و ئەقرەعی کوڕی حابس هاتن بۆ لای ئەبوبەکر پێیان وت: ئەی خەلیفەی پێغەمبەری خوا، لای ئێمە زەویەکی وشک هەڵاتوی لێیە، نە گژوگیای تیایە نە سودێکی لێبینراوە پێشتر، ئەگەر جەنابت بتەوێ سەرو پارچە زەویمان بدەیتێ هەتا بیکێڵین و شتی تیابچێنین؟ ئەبوبەکر سەرو پارچە زەوی داپێیان، وە نوسراوێکیشی بۆ نووسین و عومەری کوڕی خەتابیشی کرد بە شاهید لەکاتێکدا عومەر لەوێ نەبوو، ئەبوبەکر پێی وتن: بچن بۆ لای عومەر هەتا ئەویش شاهیدبێت لەسەری.

عومەر گوێی لێگرتن و نوسراوەکەش بەدەست ئەوانەوە بوو دەیان خوێندەوە بۆی، پاشان عومەر دڕاندی و فڕێیدا و توڕەبوو پێی وتن ئەمە نوسراوێکی زۆر خراپە، عومەر وتی پێیان: پێغەمبەر (صَلَّى الله عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ) ئەوکات دڵی رادەگرتن چونکە ئیسلام لاواز بوو، ئێستا خوای گەورە ئیسلامی بەهێزکردووە، بڕۆن هەوڵ و کۆششی خۆتانبدەن، خوای گەورە چاودێرتان دەبێ ئەگەر ئێوە شوانی بکەن.

گەڕانەوە بۆ لای ئەبوبەکر بە بێزاریەوە، وتیان: سوێند بەخوا نازانین تۆ خەلیفەی یان عومەر؟ ئەبوبەکر پێی وتن: ئەو خەلیفەیە، ئەگەر بیویستایە.

عومەر زۆر بە توڕەییەوە هات بۆلای ئەبوبەکر و وەستا و پێی وت: پێم بڵێ دەربارەی ئەو زەویەی کە ویستوتە بیدەی بەو دووپیاوە، ئایە ئەم زەویە هی تایبەت خۆتە یان هی زەوی گشتی موسوڵمانانە؟!

ئەبوبەکر وتی: هی گشتی موسوڵمانانە.

عومەر وتی: ئەی چۆن تایبەتی دەکەیت بەو دوو پیاوە بەبێ ئەوەی موسوڵمانان ئاگاداربن؟

ئەبوبەکر وتی: راوێژم بەو خەڵکانەی دەوروپشتم کرد ئەوکات بڕیارمدا لەسەری.

عومەر وتی: ئەگەر راوێژت بە کەسەکانی دەوروپشتت کردبێت ئەی ناشبێ هەموو موسوڵمانانیش ئاگاداربن و رازیبن؟

ئەبوبەکر وتی: ئەوەی تۆ دەیڵێی ئەوە حەقترە، تۆ لەمن بەهێزتری بۆ ئەم کارە بەڵام خۆت منت پێشخست. ئا بەم شێوەیە ئەبوبەکر دەربارەی خۆی دەدوا، هیچ کات پلەوپۆست توشی لوتبەرزی و غەراربونی نەدەکرد، بەم شێوەیە گەورەییە ژیا هەتا ئەو رۆژەی وەفاتی کرد لە ٢٢ جومادی دووەم ساڵی ١٣ هیجریدا.

((عائیشە هات بۆ لای ئەبوبەکر، لەوکاتەدا ئەبوبەکر نەخۆش کەوتبوو بەو نەخۆشیەش مرد، لەو کاتەدا ئەبوبەکر نارەحەت بوو ئەم دێڕە شیعرەی وت:

لعمرک ما يغنى الثراء عن الفتى          اذا حشرجت يوما وضاق بها الصدر

واتە: خۆشگوزەرانی و دەوڵەمەندی چی سودی هەیە بۆ مرۆڤ، ئەگەر رۆژێ بکەوێتە جێگەو سنگی بێتەوە یەک)).

وەک کەسێکی تورە سەیری کردم، پاشان وتی: بەو شێوەیەش نیە ئەی دایکی باوەرداران، بەڵام وتەی خوا راسترە: کە دەفەرموێ: ﴿وَجَآءَتۡ سَكۡرَةُ ٱلۡمَوۡتِ بِٱلۡحَقِّۖ ذَٰلِكَ مَا كُنتَ مِنۡهُ تَحِيدُ ١٩﴾ ق: ١٩

پاشان وتی: ئەی عائیشە من کاتی خۆی باخچەیەکم بە تۆداوە، بەڵام وام پێباشە بیگێڕیتەوە بۆ ناو ماڵی پاشبەجێماوەکانم - میرات - ، عائیشە وتی بەڵێ گەڕاندمەوە.

پاشان ئەبوبەکر وتی: ئێمە لەو کاتەوەی ئەم بەرپرسیارێتیەمان وەرگرتوور نە دینار و نە درهەمێکی موسوڵمانانمان نەخواردوە، بەڵام خواردنی سادە و ساکاری موسوڵمانانمان خواردووە، بەرگی سادەو زبرینمان پۆشیوە، نەزۆر نەکەم سامانی موسوڵمانانمان نەکەوتۆتە لا، تەنها ئەو خزمەتکارە حەبەشیە نەبێت لەگەڵ ئەم ئەسپەدا بۆ ئاودێران و ئەم پارچە قوماشەش، ئەگەر مردم بیانێرن بۆ عومەر و خۆتانی لێ رزگاربکەن، منیش وامکرد، کاتێک ئەم شتانە گەیشتە دەستی عومەر، دەستی کرد بە گریان و بەدەم خۆیەوە دەیووت: رەحمەتی خوا لە ئەبوبەکر، بەڕاستی کەسی دوای خۆی ماندوکردووە...

عەبدولرەحمانی کوڕی عەوف کە لەوێ بوو وتی: پاک و بێگەردی بۆ خوای گەورە، ئەبوبەکر رۆیشت و لەدوای خۆی بەندەیەکی حەبەشی و ئەسپێکی ئاودێری و پارچە قوماشێکی لەدوا بەجێما کە نرخەکەی پێنج درهەمە!!

عەبدولڕەحمانی کوڕی عەوف وتی: فەرمانت بەچییە؟

عومەر وتی: دەیان گێڕینەوە بۆ ماڵ و منداڵەکەی، وە وتی: سوێندبەخوا لە سەردەمی حوکمی مندا ناکرێ و ناگونجێت کە ئەبوبەکر ڕۆیشتبێت و من شتانێکم لابێ کە ئەوان پێویستیان بێت، مردن لە پێشتر وەک لەمە.

## خەلافەتی عومەری کوڕی خەتاب (رضی الله عنه)

"لە (جمادی دووەم)ی ١٣ هیجری بۆ (ذي الحجة)ی ٢٣ هیجری"

**عومەری کوڕی خەتاب چۆن بووە خەلیفە؟**

لەوکاتەی کە ئەبوبەکر هەستی کرد کە ئەم نەخۆشیەی مردنی پێوەیە، هەوڵیدا کە لەناو موسوڵمانان کەسێک دیاری بکات کە کۆڵی خەلافەت بگرێتە ئەستۆ، چونکە دەترسا لەوەی لەدوای مردنی خۆی جیاوازی بکەوێتە ناو موسوڵمانان و ئاژاوە بەرپابێت، هەربۆیە بە بیریدا هات کە عومەر دیاریبکات بۆ ئەم کارە، بۆ ئەم کارەشی هات راوێژی بە هاوەڵانکرد ئەوانەی کە ئەهلی حەل و عەقد بوون، لەوانە (عەبدول رەحمانی کوڕی عەوف، عوسمانی کوڕی عەفان، سەعیدی کوڕی زەید، ئوسەیدی کوڕی حضیر، وە لە خەڵکانی کۆچکەران و پشتیوانانیش)، لەدوای گفتوگۆو تاوتوێکردنی باسەکە لەگەڵ ئەبوبەکر، هەموو خەڵکەکە رازیبوون لەسەر ئەوەی کە ئەبوبەکر دیاری کردبوو ئەویش عومەری کوڕی خەتابە، هەرچەند هەندێک کەس نارازی بوون لەسەر عومەر، چونکە پێیان وابوو کە ئیمامی عومەر کەسێکی توند و رەقە و بۆ ئەم کارە نەشیاوە، بەڵام لەدواتردا ئەوانیش دڵیان دامەزرا لەسەر قسەکانی ئەبوبەکر و رازی بوون پێی.

لەدوای ئەوەی کە ئەبوبەکر دڵنیابۆوە لەوەی کە راوێژکارەکان و خەڵکەکەش رازی بوون لەسەر دانانی عومەر بۆ خەلیفایەتی، فەرمانی کرد بە خەڵکەکە لە مزگەوت کۆببنەوە، جەنابیشی تەشریفی برد بۆ مزگەوت و چووە سەر بەردێک و بە خەڵکەکەی وت: (ئەی خەڵکەینە، ئایە رازی دەبن بەوەی کە من دەیکەم بە جێگرەوەی خۆم؟،

سـوێند بەخـوا مـن هەمـوو توانـای خـۆمم خسـتۆتەکار بـۆ ئەم کارە هەتـا شـیاوترینتان دیاری بکەم و خزم و کەسوکاری خۆم دانەناوە، بەڵکو عـومەری کوڕی خەتابم دیاری کردووە دەی سا ئێوەش گوێیلێبگرن و گوێڕایەڵیبکەن).

وتیان: گوێمان ڕاگرت و گوێڕایەڵین...

لەوکاتەدا ئەبوبەکر داوای لە خوای گەورە کرد و وتی: (ئەی خوایە ئەم کارەم کرد تەنها مەبەسـتم ئەوە بـووە کە چاکسـازیبکەم، وە ترسـم لەوە بـووە کە ئـاژاوە دروسـتبێت، ئیجتیهادم کردو باشترین کەسیانم لێ هەڵبژاردن و تۆش باشتر دەزانی، وە دڵسۆزترین و بەهێزترین کەسیانە، دەی سا خوایە هاوکارو پشتیوانیان بە).

لە ڕۆژی دواتـردا ئەبـوبەکر وەفـاتیکرد و لە تەنیشـت پێغەمبەر(صَلَّی الله عَلَیْـهِ وَسَـلَّمَ) بەخاک سپێردرا، خەڵکی بەرەو مزگەوت بەڕێکەوتن بۆ ئەوەی بەیعەتبدەن بە عـومەری کوڕی خەتاب  کە لە ڕۆژی ٢٣ جمادی دووەمی ساڵی ١٣ هیجریدا بوو، ئابەم شێوەیە هەموو ئوممەت کۆدەنگ بوون لەسەر وەرگرتنی خەلیفایەتی عومەری کوڕی خەتاب.

بوخـاری لە صـەحیحەکەیدا هێنـاویەتی دەڵێـت: پێغەمـبەر صَـلَّی الله عَلَیْـهِ وَسَـلَّمَ فەرمووی:( لقد کان فیما قبلکم من الامم ناس محدثون، فإن یکن في أمتي أحد فإنه عمر)

واتە: ( لە ئوممەتەکانی پـێش ئێـوەدا لەناویانـدا "محـدث" هەبـوون، ئەگەر لە ئـوممەتی مندا کەسێک هەبێت ئەوە عومەرە)

واتەی "محـدث" (ئیلهـام کـراو)، لە ریـوایەتێکیتردا کە تەبەرانی دەیگێڕێتەوە پرسـیار لە پێغەمبەر صَلَّى الله عَلَيْهِ وَسَلَّمَ کـرا کە "محـدث" چـیە؟ فەرمـوی: (فریشـتە لەسـەر زمانیـان قسـە دەکـات)، پاشـان قورئـانیش لە چەنـدین ئایەتـدا پشـتگیری بۆچـونی عـومەردا دەکات لەهەنـدێک بابەتـدا، ئێسـتا دەچیـنە سـەر خەلافەتـی عـومەر کە هەروەک خەلیفەی پێشتری دەستدەکات بە فتوحات.

## فتوحاتەکانی ناوچەی رۆم (وڵاتی رۆم)

ئەبوبەکر(خـوا لێی رازیبێـت) فەرمـانی کـرد بە خالیـدی کـوڕی وەلیـد کە لە عێراقەوە بچێـت بـۆ شـام لەگەڵ کۆمەڵێـک لە سـوپاکەی کە لە عێراق بـوون، ئەم رۆیشـتنەی خالیـد لە عێراقەوە بـۆ شـام لە مێژوودا زۆر بەگەورەیـی باسـی لێوەدەکرێـت، چـونکە خالیـد بە بیابـانێکی زۆر گەورە و وشـکدا سـوپاکەی گواسـتەوە کە لە مێـژوودا شـتی وارِوینەدابـوو، بە بیابـانی سـەماوە ناسـراوە، ئەم بیابانەی بە خـۆی و سـوپاکەوە بـڕی بە ئـاوێکی کەمەوە کە نزیـک بـوو سـوپاکەی لەناوبچێـت، بەڵام خالیـد زۆر سـوور بـوو لەسەر ئەوەی کە بگاتە شام و بگات بە سوپاکانی تری موسوڵمانان و هاوکاریان بکات.

خالیدی کوڕی وەلید گەیشتە شام دوای بڕینی ئەو رێگا دوورو درێژ و نارەحەت کە لەو بیابانە توشی بوو، بەگەیشتنی لەگەڵ سەرکردایەتی ئەو چوار سوپایەی کە ئەبوبەکر نـاردبووی بـۆ شـام کۆبـۆوە، خالیـدی کـوڕی وەلیـد پێشـنیاری کـرد بـۆ سـەرکردایەتی هەرچـوار سـوپاکە کە پێویسـتە هەمـوو سـوپاکان لە ژێـر سـایەی یەک سـەرکردەدا کـۆببنەوە، بەڵام لەوەش دەترسـا کە هەمـوو کـۆنەبنەوە لەسـەر یەک کەس کە سـەرکردایەتی هەمـوویـان بکـات، بـۆیە خالیـد هـات شـێوازێکی زۆر باشـی بەکارهێنـا بـۆ رازیکردنی هەمویـان، لەکاتێکدا نەیهێشـت هیچ یەک لەو سـەرکردانەی هەبوون دڵیـان بڕەنجێت کە ئەبوبەکر ناردبونی، خالید پێی وتن:-

((سـەرکردایەتی سـوپاکە دابەش دەکەیـن بە پێی رۆژ واتە رۆژی یەکەم کەسێک بێـت دواتر کەسێکی ترمان بێت هەتا هەموومان بەشداردەبین، بەڵام داوادەکەم کە یەکەم رۆژ بدەن بە من))

هەموویان رازی بوون لەسەر ئەوەی کە خالیدی کوڕی وەلید یەکەم رۆژ سەرکردایەتی سوپاکە بکات، خالید هات سوپاکەی دابەش کرد بەچەند کۆمەڵێکەوە و هەر کۆمەڵەیەکی کرد بە هەزار کەسی، پاشان سەرکردەیەکی بەهێزو ئازای دانا بۆ هەر کۆمەڵێکیان.

**جەنگی یەرموک ٤ی رەجەب ساڵی ١٣ هیجری:**

هەردوو هێز نزیک ڕووباری یەرموک بەیەک گەیشتن، ژمارەی موسوڵمانان لەو رۆژەدا نزیکی چل هەزار کەس بوون(٤٠٠٠٠) و ژمارەی رۆمەکانیش نزیکی دووسەد و پەنجا هەزار کەس بوون (٢٥٠٠٠٠)، رۆمەکان لە ڕویی ژمارەو چەکەوە زۆر پێشکەوتو بەهێز بوون، هەتا پیاوێک لە موسوڵمانان کە ئەم دیمەنەی بینی وتی: (ئای ڕۆمەکان چەند زۆرن و موسوڵمانان چەند کەمن)، کاتێ خالید گوێی لە قسەی ئەم کابرایە بوو توڕەبوو وتی: (بەڵکو ڕۆمەکان چەند کەمن و موسوڵمانان چەند زۆرن)، ئەگەر زۆری سەرباز مانای سەرکەوتن بێت و کەمی سەربازیش مانای دۆڕاندن بێت ئەوا ئێمە کە خوای گەورە پشتیوانمانە و لەگەڵمانە زۆرترین لەوان.

سەربازەکانی خالید بە پێ ئەو رێگای بیابانەیان بڕیبوو بۆیە لە روبەڕوبونەوەیەکی ئاوادا بەهێز بوون و نەدەترسان.

ئەم قسانەی خالید کردی لەم کاتەدا گوزارشتە لە دینداری و پاکێتی و ئیخلاصی خالید بۆ خوای گەورە، ئەو لە تێگەیشتنی بۆ هێزی خوای گەورە دەیزانی کە زۆربونی ژمارە گرنگ نیە، بەڵکو ئەوە گرنگە کە کام کۆمەڵەیان خوای گەورەی لەگەڵدایەو پشتیوانیانە ئەگەر چی لەڕوی ژمارەشەوە کەم بن، وە وتی: بونی ئێوە لەم جەنگەدا کە

لەگەڵمدان زۆر دڵخۆش و ئاسودەم ئەگەرچی هێزی دوژمن چەند بەرامبەریشە بەڵام بونی ئێوە هیوای سەرکەوتنی بە من بەخشیوە!!

خالید فەرمانیکرد کە سورەتی ئەنفال بخوێنن پێش دەستپێکردن بە جەنگەکە، هەروەها ئەبوهورەیرەش کە لەوێ بوو قسەی بۆ کردن و ئەبو سوفیانیش بەهەمان شێوە ئیتر خەڵکەکە تەواو دڵ جێگیربوون و بەهێزەوە وەستان بەرامبەر دوژمن.

لەم کاتەدا لەناو ئاپۆڕی موسوڵماناندا نێردەرێک هات کە هی خەلیفە بوو، خەڵکی دەوریانداو ئەویش پرسیاری خالیدی کرد، خەڵکەکە دەیان ویست بزانن کە هەواڵی مەدینە چیە؟، وە نێردەرەکە موژدەی پێدان کە مەدینە زۆر باشەو لەخێرو خۆشیدان، هەتا خۆی گەیاندە لای خالید و هەواڵی مردنی ئەبوبەکری صدیقی پێدا، خالید بە کابرای نێردەری وت کە بەنهێنی بیهێڵێتەوەو ئاگای لە رەفتاری بێ هەتا موسوڵمانان نەزانن، خالید هەواڵەکەی بە نهێنی هێشتەوە بۆ ئەوەی سەربازەکان توشی مەلەل نەبن و نە ببێتە هۆکاری لاواز بونی جەنگەکە، جەنگ دەستپێکرد و ئیبن و کەسیر بەم شێوەیە باسیدەکات: ((جەنگێکی زۆر سەخت و گەورە، لەژێر تینی گەرمای خۆردا، شمشێرەکان ترسی دەخستە ناو روحی کەسەکان، سەرەکان لە لاشەکان جیادەبونەوەو دەپەڕین، لاشەکان کەرت و پەرت دەبوون)).

## موسوڵمان بونی سەرکردەیەک لە سەرکردەکانی ڕۆم:

لە گەرمەی شەڕدا یەکێک لە سەرکردەکانی رۆم هاتەدەرەوەی ریزەکان کەناوی "جەرجە" بوو خالید بۆی چوو، هەردولا لەیەک نزیک بونەوە هەتا ملی ئەسپەکانیان دای بەیەکدا، جەرجە وتی: ئەی خالید! راست پێم بڵێ و درۆم لەگەڵدا مەکە چونکە

پیاوی ئازا درۆناکات، وە فێڵم لێمەکە چونکە پیاوی بەخشندە فێڵ ناکات، ئایە راستە کە خـوای گەورە بە پێغەمبەرەکەتـدا شمشـێرێکی لە ئاسـمانەوە بـۆ نـاردویتەخوار کە لەگەڵ مەرکەسـدا ڕووبەڕوو دەبیـتەوە زاڵ دەبیـت بەسـەریدا؟!، خالیـد وتـی: نەخێر، کابرا وتی: ئەی کەوایە بۆچی پێتدەڵێن شمشێری خوا؟

خالید وتی: خـوای گەورە پێغەمبەرێکی لە خۆمان بۆناردین بـانگەوازی هەمووماني کـرد بۆ دینەکەی، پاشـان هەندێکمان بە راسـتمان زانی و باوڕمان پێکرد وە هەندێکیشـمان بە درۆمــان زانــی و لە خۆمانمــان دورخســتەوە، ئەوانەی کە بەدرۆمــان زانــی و لە خۆمانمـان دورخسـتەوە دواتـر خـوای گەورە دڵەکانمـانی هیدایەتـداو پـاکیکردەوە و بەیعەتمان پێدا، پاشـان ئەو پێغەمبەر پێی وتم کە تۆ شـمشـێرێکی لە شـمشێرەکانی خـوا، کـافران لە بەرامبەرتـدا دەشـکێن و خـوای گەورە سـەرکەوتنت پێدەبەخشێ، ئـا لەبەر ئەمەیە کە پێم دەڵـێن شـمشـێری خـوا، مـن تونـدترین کەسـم لە موسـوڵمانان لەسـەر کافران.

جەرجە وتی: ئەی خالیـد! خەڵکی بـۆ چی بانـگ دەکەن؟ خالیـد وتـی: شـایەتی بـدات کە هیچ خـوایەک نیە بێجگە لە "الله" وە موحەممەدیش پێغەمبەری خـوایە، وە گوێڕایەڵی ئەو فەرمانانەش بکات کە لەلایەن خوای گەورەوە دابەزیـوە.

جەرجە وتی: ئەگەر وای نەکرد؟

خالید وتی: دەبێ جزیە بدات و ئێمەش پارێزگاری لێدەکەین.

جەرجە وتی: ئەی ئەگەر نەیدا؟

خالید وتی: جەنگ رادەگەیەنین لەگەڵی و پاشان شەڕی لەگەڵ دەکەین.

جەرجە وتی: ئەگەر کەسێک ئەمڕۆ باوەڕ بهێنێ و موسوڵمان بێت پلەی چی دەبێت؟

خالید وتی: هەمان پلەی ئێمەی دەبێت، ئەوە خوای گەورەیە کە کێ بەرزدەکاتەوەو کێش نزم دەکاتەوە وە کێ دەکات بەیەکەم و کێش دەکات بەکۆتای.

جەرجە وتی: ئەگەر ئەمڕۆ کەسێک بێتە ناوتان ئایە هەمان پاداشتی کەسێکی وەک ئێوەی دەبێت؟

خالید وتی: بەڵێ زۆر زیاتریش.

جەرجە وتی: ئەی چۆن لە پاداشتدا یەکسانن لە کاتێکدا ئێوە پێشتر باوەڕتان هێناوە؟

خالید وتی: ئێمە باوەڕمان هێناوە و بەیعەتمان داوە بە پێغەمبەرەکەمان لەکاتێکدا لەناوماندا بووە، هەواڵی ئاسمانی پێوتوین و بەڵگەو نیشانەکانی خستۆتەڕوو بۆمان، ئەو حەقەی وتویەتی راستەوخۆ گوێمان لێی بووە،

بەڵام ئێوە پێغەمبەرەکەتان نەدیووە راستەوخۆ و پاشان گوێتان لێنەگرتووە لەو بەڵگەو مەنجەتانەی کە وتویەتی بۆمان، ئەگەر کەسێک بێتە سەر ئەم دینە بە نیەتێکی پاک و سەر راستانە ئەی چۆن لە ئێمە پلەی بەرزترنابێت.

جەرجە وتی: سوێند بخۆ، کە راستم لەگەڵ دەڵێیت و درۆم لەگەڵ ناکەیت؟

خالید وتی: سوێند بەخوا راستگۆم لەگەڵت و وە خوای گەورە ئاگادارە لەو پرسیارانەی تۆ لەمنتکرد.

لەو کاتەدا جەرجە قەڵغانەکەی هەڵگەڕاندەوە و خۆی خوارکردەوە بۆ لای خالیدو پێی وت: فێری ئیسلامم بکە؟

خالید لەگەڵ خۆیدا بردیە ژێر خێمەکەوەو دەست نوێژی پێگرتوو دوورکات نوێژی پێکرد، سەربازەکانی رۆم کە خالید و جەرجەیان بینی لەناو خێمەکەدا وا گومانیان برد کە جەرجە لەلایەن خالیدەوە دەستبەسەر کراوە، بۆیە لە حەماسەتی گیرانی سەرکردەکەیان هێرشێکی توندیان کردە سەر موسوڵمانان و شوێنی موسوڵمانانیان گرت، بەڵام خالید و جەرجە هاتنەدەر لە ناو خێمەکەو جەرجە دەستیکرد بە شەڕکردن دژی رۆمەکان و ماتە ریزی موسوڵمانان، هاواری لە موسوڵمانان کرد کە جێگیربن و خۆڕاگربن پاشان رۆمەکان کشانەوە جێگاکانی خۆیان، خالید و جەرجە کەوتنە شەڕکردن دژی رۆمەکان، جەرجە لەم جەنگەدا شەهید دەبێت و بێجگە لەو دوورکات نوێژەی لە خێمەکە کردی فریای نوێژی تر نەکەوت!! ، جەنگ کۆتای پێدێت بە سەرکەوتنی موسوڵمانان، لەم جەنگەدا سێ هەزار موسوڵمان شەهید دەبن، وە دوانزە هەزار رۆمیش دەکوژرێن، سوپای رۆم دەکشێتەوە بۆ دیمەشق و هەرقلیش دەچێتەوە بۆ ئەنتاکیا.

هەڵوێستەیەک: دەگێڕنەوە کە هەرقل کاتێک لە ئەنتاکیا بوو بیستی سوپای رۆم تێکشکاون، بە خەڵکەکەی وت: مردن بتانگاتێ ئەرێ ئەوانەی جەنگتان لەگەڵ کردن وەک ئێوە مرۆڤ نین؟ وتیان بەڵێ وایە، هەرقل وتی: ئەرێ ئێوە ژمارەتان زۆرترە یان ئەوان؟ وتیان: بەڵکو ئێمە زۆرترین، ئەی بۆچی تێکشکان؟
یەکێک لە پیاو ماقوڵانی رۆمەکان کەلەوێ بوو وتی: ئەوانە بەشەو خەریکی زیکرو پەرستیشن، بەرۆژیش بەڕۆژون، پابەندن بە بەڵێنەوەو دەیبەنەسەر و فەرمان

بەچاكە دەكەن و ڕێگری لە خراپەدەكەن، لەناو یەكتریدا بە ویژدانن، بەڵام ئێمە مەی دەخۆینەوە و شەرواڵ پیسی دەكەین، حەرام دەخۆین و پەیمان شكێنی دەكەین، تورەدەبین و ستەم دەكەین، فەرمان بە خراپەدەكەین و خوا لە خۆمان دەرەنجێنین، خراپە لەسەر زەوی بڵاودەكەینەوە، هەرقل وتی: تۆ راستت وت لەگەڵمدا.

**عومەری كوڕی خەتاب خالیدی كوڕی وەلید كەنارگیردەكات:**

سەركەوتنە یەک لەدوای یەكەكانی خالید كە سەرەتا بە عێراق دەستیپێكرد، پاشان ئەو موعجیزە گەورەیەی كە بەتێپەڕبونی بیابانەكەدا ئەنجامیدا بۆ شام، پاشان سەركەوتنی لە جەنگی گەورەی یەرموک، ئەمانە هەمووی بە سەركردایەتی خالیدی كوڕی وەلید ئەنجامدرا، بەڵام لەگەڵ گواستنەوەی كاروباری خەلافەت بۆ عومەری كوڕی خەتاب یەكەمین كار كە هەستاپێ وەک خەلیفە كەنارگیركردنی خالیدی كوڕی وەلید بوو لە سەركردایەتی سوپا، وە دامەزراندنی ئەبو عوبەیدەی كوڕی جەراح وەک سەركردەی سوپای موسوڵمانان لە شام.

لێرەدا پرسیارێک دێتە پێشەوە ئەویش ئەوەیە كە بۆچی عومەر مات خالیدی كەنارگیر كرد لە سەركردایەتی سوپا لە كاتێكدا ئەم هەموو سەركەوتنانە لەسەر دەستی ئەو بەدیهات؟

لەڕاستیدا ئەم رووداوە قسەو باسی زۆر لێكراوە لەناو خەڵكیدا وە خوێندنەوەی زۆری بۆكراوە، ئەم روداوەی كە لەنێوان ماوەڵە بەڕێزەكاندا رویداوە خەڵكی خوێندنەوەیەكی ماددیەنەی بۆدەكەن.

**مامۆستا عەقاد دەربارەی کەناگیرکردنی خالید دەڵێ:**

((خەڵکی دەڵێن – هۆکاری ئەم کەنارگیریە چیە؟ - ئایە روحیەتی مونافەسەکردنە، یان هەستکردنە بە هاوشێوەبونی یەک لە کەسەیاتیدا، وە خەڵکی دەڵێن لابردنی خالید پەیوەندی بە هەڵەکردنی خالیدەوە نیە، وە خەڵکی تر هەن دەڵێن کە پێچێت شتێک لە کۆندا رویدابێت بەڵام ئێستا تازەبۆتەوە ئەمە بوویێتە ئەوەی کە خالید لە جیهاد دوربکرێتەوە))

پاشان دەڵێ((ئەو کەسانەی کە خالید بەوە تۆمەتباردەکەن کە گوایە عومەر گومانی لێ هەبووە بۆیە لایداوە، دەنا بە بێ هۆکار بۆچی لایدەبات؟، لە راستیدا ئەمە دوورە لە حەقیقەتەوە چونکە عومەر کاتێک لە سەرکردایەتی سوپای شام لایدا نامەی بۆ هەموو ناوچەکانی ژێر دەستی موسوڵمانان نارد و پێی وتن کە خالید لابراوە نەلەبەر ئەوەیە هەڵەیەکی کردوە وە نەلەبەر ئەوەیە کە خیانەتی کردووە، بەڵکو لابردنی خالید پەیوەندی بەوەوە هەیە کە نەم ویستووە خەڵکی بەهۆی خالیدەوە توشی فیتنە بن چونکە زیاد لە سنوری خۆی خالیدیان تەقدیس کردووەو سەرکەوتنی جەنگەکان دەگێڕنەوە بۆ خالید نەک بۆ خوای گەورە، بەمەش عومەر توانی لە کاتی خۆیدا رێ لەو فیتنەیە بگرێ کە خەریک بوو توشی ئوممەتی ئیسلامی ببێت.

لەڕاستیدا ئەم بابەتە لەکاتی خۆشیدا بەو شێوەیە نەبووە کە ببێتە هۆی ئەوەی کە سەربازەکانی خالید بیانەوێ دژی عومەر بوەستنەوەو ئاژاوە دروستبکەن، چونکە بەشتێکی سروشتی وەریانگرتووەو وە لابردنی خالیدیش بەتەنها نەبووە بەڵکو عومەر هەر بەهاتنی بۆ سەر خەلافەت کۆمەڵێک گۆڕانکاری کرد بەسەر والی و سەرکردە

سـەربازیەکاندا، خالیـدیش بۆخـۆی زۆر سـیقەو متمـانەی بە کارەکـانی عـومەر بـووەو زانیـویەتی کە عـومەر کارێـک ناکات کە سـودی موسـوڵمانانی تێـدا نەبێـت، وە هەروەها خالیـد ئەوەشـی بـاش زانیـوە کە عـومەر ئەمیری موسـوڵمانانەو دەبێ هەمـوو لایەک گوێڕایەڵی بۆدەرببڕن، پاشـان خالیـدیش هەمـوو کارەکانی کە کـردووە بـۆ ئەوەی کـردووە کە خـوای گەورە لێی رازیبێـت و بە دڵێکی پاکەوە کردویەتی نەک بـۆ ئەوەی پلەو پۆسـت وەربگـرێ بـۆیە بە لابردنی هـیچ کاردانەوەیەکی وای نەبـوو کە ببێـتە جێی باسـی خەڵکی، خالیـد دەیـوت: ئەگەر ئەمـڕۆ سـەرکردەبم و بەیـانی بکـرێمەوە بە سـەرباز لایمـن هـیچ شـتێک نـاگۆڕێ، ئەمەش نیشـانەی ئـیخلاص و دینـداری خالیـدە، هەروەهـا خالیـد دەفەرمـوێ ئەوەشـتەی کە لە دونیـادا کـردبێتم و دڵـم پێـی خۆشـبێت ئەوەیە کە لە شـەوێکی سـاردی تاریکـدا لە سـریەکی موهاجیرانـدا رۆژم کـردبێتەوەو چـاوەڕێ ئەوەم کردووە کە بەیانی بگەم بە رووبەڕووبوونەوەی کافران و جیهاد بکەم.

هەروەها بۆ زیاتر بەرچاو رۆشنی ئەم باسە ئەو ریوایەتە دەهێنینەوە کە ئیمام ئەحمەد لە عەبدول مەلیکی کوڕی عـومەیر دەگێڕێتەوەو دەڵێ: ((عـومەری کوڕی خەتـاب ئەبـو عوبەیدەی کوڕی جەڕاحی کـرد بە سـوپا سـالاری شـام و خالیـدی کوڕی وەلیـدی لابـرد لەسەری، خالید لەبەرامبەر ئەم کارەی عومەر وتی: عـومەر کەسێکی بـۆ ناردوین کە بە ئەمینی ئەم ئـوممەتە ناسـراوە، ئەمەشـم لە پێغەمـبەرەوە (صَـلَّى اللهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ) بیسـتووە دەربـارەی ئەبـو عوبەیـدە، وە ئەبـو عوبەیـدەش وەڵامی خالیـدی دایەوەو وتـی: منیش گوێم لە پێغەمبەر بووە (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرمویەتی: خالید شمشێرێکە لە شمشێرەکانی خوای گەورە)).

هەروەهــا تەبەری لە مێژووەکەیــدا دەگێـڕێتەوە: ((ئەبــو عوبەیــدە ئەو نوســراوەی کە کەنــارگیرکردنی خالیــدی تێــدا نوســرابوو لێی بێــدەنگ بــوو بــوو دوای ٢٠ رۆژ نــامەکە دەگاتە دەســتی خالیــد، کاتێـک کە خالیـد نـامەکەی بەدەسـت گەیشـت و خوێنـدیەوە هەڵوێستی زۆر گەورەو جوان بوو وە داواکاریەکەشی قبوڵکردوو وتی بە ئەبو عوبەیدە: خـوای گەورە لێت خۆشبێت، ئەم نامەیە لە ئەمیری موسـوڵمانانەوە هاتووە بۆچی پێت نەوتـوم و نـوێژت لەدوای مـنەوە کـردووە کە جەنابـت گەورەو خـاوەن دەسـەڵاتی نەک من؟، ئەبو عوبەیدە وتی: تۆش خوای گەورە لێت خۆشبێت، نەم ویست ئەم هەواڵەت پێڕابگەینم و ویستم لە دەمی کەسێکیترەوە بیبیستی، وە ئێستاش هەواڵەکەت زانی، دەسەڵات و فەرمانڕەوایەتی دونیام ناوێت، وە کاریش بۆ دونیا ناکەم، ئەوەی دەبینرێت بەرەو ئـاوابوون و تەواوبـوون دەچێـت، وەئـێمە هەردووکمـان وەک دووبـرا وەهـاین و هەڵئەســتین بە جێبەجێکردنــی فەرمــانی خــوای گەورە، پیــاو زیــانی پێناگــات ئەگەر کەســێکیتر بخــرێتە شــوێنی لە هەڵســوڕاندنی کاروبــاری دیــن و دونیــادا، بەڵکــو والی دەزانێـت کە نـزیکە بکەوێـتە فیتـنەو هەڵەوە کاتێـک دوچـاری لەخۆبـایی بـوون ببێـت، مەگەر کەسێک خودا بیپارێزێت ئەوانەش زۆر کەمن)).

خـوای گەورە لێت رازیبێت ئەی خالید... خـوای گەورە لێت رازیبێت ئەی ئەبو عوبەیدە...

بەراسـتی کاتێـک ئەم حەقیقەتـانە دەخـوێنینەوە دڵەکان دەکەونە لەرزیـن و چاوەکـان پڕدەبن لە فرمێسـک لە بـۆ ئەو هەڵوێسـتە جوانـانەی کە هـاوەڵان هەیـانبووە بەرامبەر بەیەک، ئــابەم شــێوەیە ویســتویانە بەرەنگــاری دوژمنــان ببــنەوە کە لەنــاو خۆیانــدا بــاوەڕێکی پتەویــان بەیەک هەبــووە، هاوکــارو هاوســۆزی یەکتــری بــوون، مێـژووی

موســـــوڵمانان پڕپەتـــی لەم شــــاکارە جوانــــانە بەڵام  بەداخەوە کە موســـــوڵمانان نایخوێنەوەو لێی بێئاگان، ئەم ڕەفتارە جوانانە ناکەن بە سەرمەشقی خۆیان کە جێی شانازیمانن...

لەدوای ئەم باسانە بۆمان دەردەکەوێت کە لابردنی "خالیدی شمشێری" خوای گەورە لە لایەن عومەری فاروقەوە بۆ ئەوە بووە کە عومەر ترساوە لەوەی کە ببێتە فیتنە بۆ هەندێک لەو موسوڵمانانەی کە ئیمانیان لاوازە، ئەگەر چی عومەر دەشیزانی کە بوونی خالید لە سەرکردایەتی سوپای موسوڵمانان سەرکەوتنەکان زیاتردەکات، بەڵام لە پێناو پاراستنی عەقیدەی موسوڵمانان ئەمەیکرد، عومەر هیچ شتێکی لەوە بەگەورەتر نەدەزانی کە پارێزگاری لە باوەڕی موسوڵمانان بکات...

لەدوای ئەم روداوە، ئەوەی چاوڕێ نەدەکراو  رویدا ئەوەبوو کە سەرکەوتنەکانی موسوڵمانان بەردەوام بوو، خالید بەردەوام بوو وەک سەرکردەی پۆلێک لە سوپاکەی ئەبو عوبەیدە، هەرگیز خالید توشی راوەستان نەبوو وە حەماسەت و تواناکەی لەدەست نەدا، لەدوای ئەم باسە دەبینین کە چۆن دەوری خۆی بینیوە لە فەتحکردنی دیمەشق.

ئێستا دەگەڕێینەوە سەر باسەکانی فتوحات کە لە دوای جەنگی یەرموک رویانداوە...

لەدوای کشانەوەی سوپای رۆمەکان بۆ دیمەشق، وە کشانەوەی هەرقل بۆ ئەنتاکیا، رۆمەکان کەوتنەوە کۆکردنەوەی سوپاکانیان و خۆ رێکخستنیان بۆ جارێکیتر، کەئەم جارە ژمارەیان گەیشتە هەشتا هەزار کەس لە شوێنێک کۆبوونەوە کەناوی "فحل"

بوو، دۆڵێکە لە ئوردون[1] ئەبو عوبەیدە کەوتە نێوان دوو بۆ چونەوە ئەویش ئەوەیە کە ئایە هێرشبکاتە سەر دیمەشق یان بگەڕێتەوە بۆ فحل؟ بۆ ئەوەی لەم کارەدا یەکلابێتەوە نامەی بۆ عومەری کوڕی خەتاب نارد و راوێژی پێکرد و باسی واقیعەکەی بۆکرد، عومەریش وەڵامی دایەوە کە وەڵامەکەی عومەر هەستیپێدەکرێ کە لەو پەڕی هۆشیاری و لێهاتویەوە وەڵامی داوەتەوە، عومەر وتی:-

(سەرەتا بە دیمەشق دەستپێبکە، چونکە دیمەشق قەڵای شامەو ناوەندی وڵاتیانە، هەروەها خەڵکی فحل یش سەرقاڵ بکەن بە چەند ئەسپ سوارێکەوە، ئەگەر پێش دیمەشق فحل ئازادکرا ئەوە پێمان خۆشە، ئەگەر ئازادکردنی دیمەشقیش پێشکەوت ئەوا کەسێک جێگیر بکەن لە دیمەشق و خۆت و ئەمیرەکانی تر بچن بۆ فحل، جاکە ئەوێش ئازاد کرا خۆت و خالید بەڕێبکەون بەرەو حمص، وە عەمری کوڕی عاص و شەرحبیل واز لە ئوردون و فەلەستین بێنن...

---

[1] سەرنجێک: لە شایەتی دانێکی رۆژئاواییەوە

ئەرنۆڵد لە کتێبی "الدعوة الإسلامية" دەڵێت: کاتێک کە سوپای موسوڵمانان گەیشتنە دۆڵێک لە ئوردون و ئەبو عوبەیدە سەربازگەی دانا لە فەحل، خەڵکی ئەو ناوچەیە کە مەسیحی بوون نامەیان نارد بۆ موسوڵمانان و وتیان: (ئەی کۆمەڵی موسوڵمانان ئێوە لای ئێمە خۆشەویسترن لە رۆمەکان ئەگەر چی رۆمەکان لەسەر دینی ئێمەن، ئێوە بەوەفاترن لەوان، دەستپارێزن و زوڵمان لێناکەن، باشترە لەژێر ولایەتی ئێوەدابین، بەڵام سەرکەوتن بەسەرمانداو بونە حاکم بەسەرمانەوە، خەڵکی " حمص" یش دەرگای شارەکەیان داخست و نەیان هێشت سوپای هەرقل داخڵ بێت وە بە موسوڵمانەکانیشیان راگەیاند کە ئێمە ولایەتی ئێوەمان پێ باشترە وەک لە زوڵمی ئیغریقیەکان کە لە خۆمانن.

بەڕاستی کاتێک ئەم نامەیەی فاروق دەخوێنیتەوە بۆت دەردەکەوێ کە چەند بە وردی پلانەکەی داڕشتووە، لەکاتێکدا یەکەم کاری جەنگی بووە کە سەرپرشتی کردووە لەو کاتەوەی بووە بە خەلیفە...

## ئازادکردنی دیمەشق:

سوپای موسوڵمانان بەڕێکەوتن بەرەو دیمەشق، گەیشتنە رۆژهەڵاتی شارەکە و راستەوخۆ دەوری شارەکەیانداو گەمارۆیان خستەسەری، دیمەشق شارێکی گەورەیە، شورایەکی پتەوی هەیە کە لەبەرد بونیادنراوە و بەرزیەکەی شەش مەترە و پانیەکەشی سێ مەترە، شوراکە دەرگایەکی زۆر گەورەی هەیە، وە بەدەوری شوراکەشدا چاڵ هەڵکەندراوە کە پڕەیتی لە ئاو، پانی ئەو چاڵەش سێ مەترە، دیمەشق شارێکی پارێزراو پتەوەو گەورەیە، گەمارۆکە بەردەوام بوو چەند مانگێکی خایەند، هەتا مانگی سارد و سەرما هات، هەواڵگیری موسوڵمانان بەردەوام چاودێری شارەکەیان دەکرد، خالید بۆخۆی هەوڵگیری تایبەتی هەبوو کە زۆر بەوریایەوە کارەکانیان رادەپەڕاند، هەواڵ گەیشتەوە بە خالید کە یەکێک لە سەرکردەکانی رۆم منداڵێکی بووە و زۆرێک لە خەڵکی شارەکەی بانگهێشت کردووە بۆ خواردن و خواردنەوە، ئەوانەی چووبوون بۆ بانگهێشتەکە کەوتبونە شەراب خواردن و سەرخۆش بووبوون و ئاگایان لە خۆیان نەمابوو، خالید کە ئەم هەواڵەی بیست بە فرسەتی زانی کە پەلاماریان بدات، دووکەس لە سەربازە ئازاکان لەگەڵ خالید بەڕێکەوتن بەرەو شوراکە و گوریسی شێوە پەیژەیان لەگەڵ خۆیان هێنابوو، خالید و سەربازەکانی کەلەگەڵی بوون بە هێمنی لە ئاواکە پەڕینەوە و گوریسەکەشیان لەگەڵ خۆیان هێنابوو، کاتێک پەڕینەوە گوریسەکانیان هەڵدا بۆ شوراکەو بە پارچە ئاسنێکەوە توند کرا بە دیواری شوراکەوە،

دوان لە سەربازەکان بە گوریسەکەدا سەرکەوتن بۆ سەر شوراکەو پاشان دابەزینە خوارەوەو دەستیانکرد بە شەڕکردن و دەرگای شوراکەیان کردەوەو و تەکبیریان کرد و وتیان الله اکبر بە توندی، ئیتر خالید و سەربازەکانی تریش بەرەو دەرگاکە چوون و شەڕ دەستیپێکرد لەهەموو لایەکەوە، هەتا هەموو سوپای موسوڵمانان چوونە ناو شارەکەوەو کۆنترۆڵیان کردوو ئازادکرا، لە ساڵی ١٤ هیجریدا دیمەشق فەتحکرا کە یەک ساڵ دوای جەنگی یەرموک بوو.

فتوحاتەکان بەردەوام بوو لەناو شارەکانی تری شامدا بەبێ ئەو ناوچانەی دەکەوتنە نزیک روبارەکان، وە حمص و قنسرین یش فەتحکران، هەتا عومەر نامەی بۆ عەمری کوڕی عاص نارد کە بەڕێبکەوێت بۆ ئیلیاء "بیت المقدس".

## ئازادکردنی أجنادین:

عەمری کوڕی عاص بەڕێکەوت بەرەو أجنادین لەکاتێکدا أرطبون لەوێ بوو، کە یەکێک بوو لە سەرکردە دیارەکانی رۆم کە لای هەرقل پلەی بەرز بوو، یەکێک بوو لە هەر خراپەکانی رۆم، عەمری کوڕی عاص دەوریدا و توانی زاڵ بێت بەسەریدا، أرطبون رایکرد بەرەو قودس لەوێ جێگیربوو وە نامەی نارد بۆ عەمری کوڕی عاص نووسی: (بەدڵنیایەوە لەدوای ئازادکردنی أجنادین ناتوانی هیچ شوێنێکی تر ئازاد بکەیت لە فەلەستین).

## ئازادکردنی بیت المقدس (إیلیاء):

عەمری کوڕی عاص دەوری "بیت المقدس" داو گەمارۆیەکی زۆر توندی خستەسەری و هەموو سەرچاوەیەکی لێگرتەوە، بەتەواوی لەهەموو شوێنکی دابڕی، بەڵام

لەبەرئەوەی باشوری فەلەستین سروشتێکی شاخاوی سەختی هەیە کە وەک قەڵایەک سەخت وایە، بۆیە گرتنی و زاڵبوون بەسەریدا ئاسان نەبوو، عەمری کوڕی عاص ناچار داوای لە خەلیفەکرد کە هاوکاریان بکات و وە داواشی لێکرد کە خۆی بێتە شام، نامەی نارد بۆ خەلیفەو وتی: (من چارەسەری ئەم جەنگە زۆر سەخت و گرانەدەکەم و واشی دابنێ کە ئەم شارە ئازادکراوە و لەژێر دەستدایە، ئایە جەنابت چی دەڵێی لەسەر ئەم بارودۆخە).

لەم کاتەدا عومری کوڕی خەتاب بڕیاریدا و خۆی ئامادەکرد بۆ ئەوەی بەڕێبکەوێت بەرەو شام، هەتا لە نزیکەوە چاودێری بارودۆخەکە بکات و واقیعەکە ببینێ، نامەی نارد بۆ ئەمیرەکانی "الأجناد" هەتا لەوێ بیانبینێ لە شوێنێکی دیاری کراو کە ناوی "الجابیە" یە لە کات و ساتی خۆیدا.

لە رۆژی دیاریکراودا ئەمیرەکان چاوەڕێی هاتنی عومری کوڕی خەتاب خەلیفەی موسوڵمانانیان دەکرد، هەتا بێتە ناو خاکی وڵاتی رۆم و فارسەوە و گەورەی و هەیبەتی ئوممەت نیشان بدات، عومەر بەسواری وشترێکەوە هات، وە سەرکردەی سوپای شام کە ئەبو عوبەیدەی کوڕی جەراح بوو چوو بەدەمیەوەو پێشوازی لێکرد، کاتێک عومەر نزیک بۆوە لە دەریاچەیەکی بچوک دابەزی لەسەر حوشترەکەو نەعلەکانی داکەندو گرتی بەدەستیەوە و لەگەڵ حوشترەکەدا چونە ئاوەکەوە، ئەبو عوبەیدە پێی وت ((رۆژێکی گەورەت دروستکرد لای خەڵکی سەرزەوی)).

عومەر ئێخەی ئەبو عوبەیدەی گرتو ووتی: (( ئەرێ قسەیەکی تر نەبوو بیکەی ئەی ئەبو عوبەیدە، ئێوە خەڵکانێکی ژێردەستە و لاوازو کەم بوون، بەڵام خوای گەورە بە

ئیسلام سەربەرزو بەهێزی کردن، جا ئەگەر بێجگەلە خوا داوای سەربەرزی بکەن ئەوا خوای گەورە زەلیلتان دەکاتەوە)).

کاتێک کە عومەر گەیشتە "الجابیة"، خەڵکی قودس بەمەیان زانی توشی داڕوخان بوون، بۆیە داوای ڕێکەوتنیان کرد، دەستەیەک لە خەڵکی قودس ڕۆیشتن بۆ لای عومەر هەتا گفتوگۆی لەگەڵ بکەن، عومەر ڕێکەوتنی لەگەڵ کردن لەسەر (إیلیاء) دەوروپشتەکەی وە (الرملة) دەوروپشتەکەی، وە فەلەستینیش لەدوای ئەمەوە دەکرێت بە دووبەشەوە : بەشێک لەگەڵ خەڵکی إیلیاء و بەشێکیش لەگەڵ خەڵکی الرملة...

**بەڵگەنامەیەکی مێژووی:**

خەلیفەی موسوڵمانان عومەر کاتێک ڕۆیشتە ناو قودسەوە کلیلەکانیان پێدا، پاشان عومەری کوڕی خەتاب نوسراوێکی نووسی کە تیایدا مەرجەکانی ڕێکەوتن نامەکەی تێدا دیاریکرد کە ئەمە دەقەکەیەتی:

((بسم الله الرحمن الرحیم... لە عومەر بەندەی خوای گەورەوە و ئەمیری موسوڵمانان، ئەمان درا بە خەڵکی إیلیاء، ئەم ئەمانە بۆ خۆیان و پارەو سامان و کەنیسەکانیان و سەلیبەکانیان، بۆ خراپەکارو باشەکانیان، بۆ گشت میللەتەکەیە، لە کە نیسەکانیان نیشتەجێ نابین، وە تێکیان نادەین و خۆمان تیایدا بژین، وە ئەوەی لە دەوروپشتیشیانە پارێزراو دەبێت، هەرچی لەناو کە نیسەکەشدایە لە پارەو سامان و سەلیبەکانیش، وە زۆریان لێناکرێ کە دینەکەیان بگۆڕن، هیچ کەس ئازاریان نادات، نابێ هیچ یەهودیەک لە إیلیاء نیشتەجێبێت...

هەرکەسێک لە خەڵکی "إيلياء" دەیەوێ لەگەڵ رۆمەکان بێت ئەوا رێی پێدەدەین بڕوات و سەرو ماڵیشی پارێزراو دەبێت، هەتا دەگات شوێنی ئەمانی خۆی، هەرکەسێکیش لە خەڵکی سەرزەوی دەیەوێ لە "إيلياء" بمێنێتەوە ئەوا وەک خەڵکی ئەوێ دەبێ جزیە بدات، ئەوەشی دەیەوێ بڕوات بۆ لای رۆمەکان و کەس و کاری هیچ شتێکی لێوەرناگرین، ئەمە رێکەوتن نامەیەکە لەگەڵ خوای گەورەو پێغەمبەر و خولەفای راشیدین و موسوڵمانانە، رێکەوتن نامەکە بەردەوام دەبێ هەتا ئەوانیش پێوەی پابەند دەبن واتە جزیە دەدەن.

"عومەری کوڕی خەتاب"

هەریەک لەم کەسانە شاهیدبوون لەسەری (خالید کوڕی وەلید، عەمری کوڕی عاص، عەبدول رەحمانی کوڕی عەوف، موعاویەی کوڕی ئەبو سوفیان ساڵی (١٥ هیجری ٦٣٦ میلادی))

عومەری کوڕی خەتاب لەوکاتەی ئەم رێکەوتن نامەیەی تۆمارکرد کاتی نوێژهات، "البطريق" کە دەکاتە گەورەی کەنیسە داوای لە عومەری کوڕی خەتاب کرد کە بێت لەناو کەنیسەکەدا نوێژەکەی بکات، بەڵام خەلیفەی موسوڵمانان ئەم داوایەی رەتکردەوە و وتی پێی: دەترسم ئەگەر لەوشوێنە نوێژبکەم دواتر لە داهاتودا موسوڵمانان بێن و داگیری بکەن و بڵێن کە ئەمە شوێنی نوێژکردنی خەلیفەی موسوڵمانان بووە.

بەم رێکەوتن نامەیە "بيت المقدس" ئەمانی وەرگرت خۆی و ئەوەی تیایدا بوون، خەڵکی "إيلياء" بەم ئەماندانەی موسوڵمانان زۆر دڵخۆشبوون، "أرطبون" و ئەوەی

که وەک ئەو ناڕازی بوون بەم هاتنەی موسولْمانان، ئەم ڕێکەوتن نامەیە بۆیان بوو بە دەرفەتێک کە بە ئامانەوە بەیتول مەقدس بەجێ بهێڵن و بڕۆن بەرەو میصر و تێکەڵی سوپای ڕۆم ببن کە لەوێ بوون.

بەیتول مەقدس بووە یەکێک لە ولایەتەکانی ژێر دەستی موسولْمانان وەک هەموو ولایەتەکانی تر، هەموو پیرۆزیەکانی مەسیحیەکان پارێزران و بەشێوەیەکی زۆر نەرم و نیان و داد پەروەرانە موسولْمانان ڕەفتاریان لەگەڵ مەسیحیەکان دەکرد، هەتا هەڵگیرسانی جەنگی خاچ دروشمەکان کە مەسیحیەکانی ئەوروپا هاتنە ناو بەیتول مەقدس لە ساڵی (٤٩٣ هیجری — ١٠٩٩ میلادی) کەوتنە شەهیدکردنی موسولْمانەکان بەشێوەیەکی زۆر دڕندانەو وەحشیانە بەناوی مەسیحەوە، ئەم داگیرکردنەی مەسیحیە ئەوروپیەکان بەردەوام بوو هەتا ڕۆژی "حطين" کە دەکاتە ساڵی (٥٨٣ هیجری — ١١٨٧ میلادی) لەو ڕۆژەدا "صلاح الدين" ی بەرەگەز کورد ڕزگارکردنی بەیتول مەقدسی ڕاگەیاند لە ڕۆژی ٢٧ی ڕەجەبی ساڵی ٥٨٣ هیجری، لە دواتردا لە شوێنی خۆیدا زیاتر لەسەر ئەم ڕۆژە دەدوێین و بەسەرهاتەکانی دەهێنینەوە[1].

---

[1] ئەم کتێبە وەک لە پێشەکی باسمنکردووە بەشێکە لە کتێبێکی گەورە کەباس لە مێژووی ئیسلام دەکات، بۆیە کەدەڵێ لەدواتردا دەدوێین لەسەری، بەڵام وەک ئاماژەمان پێداوە ئێمە بەس بەشی خەلافەتی ڕاشیدینمان وەرگێڕاوە، لەداهاتوو دەرفەت بوو ان شاءالله بەشەکانی تریش دەکەین.

**ئازادکردنی میصر: مانگی (ربیع أول)ی ساڵی ٢٠ هیجری:-**

لەدوای ئەوەی خــوای گەورە نیعمەتــی ئــازادکردنی بەیتــول مەقدســی بەخشــی بە موسـوڵمانان، عەمری کوڕی عـاص داوای لە عـومەری کوڕی خەتـاب کـرد کە ڕێگەی بـدات میصـر ئـازاد بکـات، عـومەر ئەمیری موسـوڵمانان لەسـەرەتادا دوودڵ و ڕارابـوو لەسـەر ئەو بابەتە، بەڵام دواتر دڵی دامەزراو رازیبوو بە ئازادکردنی میصر.

عـومەر ئەوەشی بـاش دەزانی کە پێغەمبەر (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرمایشـتی فەرمووە دەربــارەی میصــر کە هانــدانی تێــدایە بــۆ کەســێک کە بــیەوێ میصــر ئــازاد بکــات، پێغەمبەر (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) دەفەرموێ: (ئەگەر میصرتان ئازاد کرد ئەوا وەسێتان بۆ دەکەم کە باشبن لەگەڵ قیبتیەکان لەبەر ئەوەی ئەوانە خەڵکانی بـاش و بەسـۆزن) ئاماژەدان بە بەسـۆزی لەم فەرمایشـتە دەگەڕێتەوە بۆ دایکی ئیسمـاعیل کە هـاجەرەیە و خەڵکی میصر بووە، لە ریوایەتێکی تردا دەڵێ: (صهرا) ئاماژەیە بۆ خزمایەتی لەرێی ژن و ژنخــوازیەوە کە مــاریەی قیبتی بــووە خێزانــی پێغەمــبەر (صَلَّى اللهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ) کە مقەوقەس بەدیاری ناردی بۆی.

عەمری کوڕی عاص ئاڕاستەی سوپاکەی کرد بەرەو میصر کە ژمارەیان هەشت هەزار دەبـوو.عەمری کـوڕی عـاص سـوپاکەی لە فەلەسـتینەوە بـرد بەرەو "رفـح" پاشـان بێ ئەوەی بهێڵێ توشی شـەڕ بێ چووبەرەو "العریش" پاشـان سـوپاکەی لە "العـریش" ەوە برد بەرەو رۆژئاوا، هەتا گەیشتە ناوچەی "الفرما".

لەوێ لە ناوچەی "الفرما" یەکەمین جەنگ رویدا لەنێوان موسوڵمانان و رۆمەکاندا کە جەنـگەکە یەک مانـگ بەردەوامـی کێشـا، پاشــان موسـوڵمانان سـەرکەوتن بەسـەر

ڕۆمەکانداو هەموو ئەو قەڵاو قولانەی ڕۆمەکانیان شکاندو روخاندیان، هەتا ئەگەر ڕۆمەکان جارێکیتر بێنەوە نەتوانن سودی لێوەربگرن.

موسوڵمانان بەردەوام بوون لە ئازادکردنی ناوچەکانی میصر هەتا گەیشتنە قەڵای "بلبیس"، لەم قەڵایەدا هێزێکی زۆری ڕۆمی تێدابوو لەگەڵ سەرکردەی بەناوبانگی ڕۆمەکان "أرطبون" کە ئەویش لەوێ بوو، جەنگێکی گەورەو سەخت رویدا کە مانگێک بەردەوام بوو، بەڵام لەدواتردا خوای گەورە سەرکەوتنی بەخشی بەموسوڵمانان و سەرکردەی ڕۆمەکانیش "أرطبون" لەو جەنگەدا کوژرا.

پاشان موسوڵمانان بەڕێکەوتن بەرەو قەڵای "أم دنین"، کە دەکەوێتە باکوری قەڵای "بابلیون"ەوە، ڕۆمەکان کەوتنە جەنگێکی گەورەوە، سەرەتا پێیان وابوو کە عەمری کوڕی عاص راستەوخۆ سوپاکەی دەبات بەرەو قەڵای "بابلیون"، بەڵام بەشێک لە سوپاکەی ئاڕاستەکرد بەرەو رۆژئاوا بۆ کەناری ئاوی نیل، ئەمەشی بۆیە کرد عەمری کوڕی عاص هەتا دوژمن وابزانێ کە سوپاکە دەچن بۆ شوێنێکی تر، پاشان بۆ زیاتر سەر لێشواندنی دوژمن ئاراستەی باشوری وەرگرت بە سوپاکەی، لە پاشاندا کە عەمری کوڕی عاص هەواڵی پێگەیشت ڕۆمەکان بەهێزێکی زۆر گەورە کۆبونەتەوە و ئامادەی جەنگکردنن لەگەڵ موسوڵمانان، سوپای عەمر کەم بوو لەبەرامبەر سوپای ڕۆمەکاندا بۆیە عەمر داوای لە خەلیفە کرد کە هێزی پشتیوانی بۆبنێرێت.

عومەری کوڕی خەتاب وەڵامی عەمری دایەوەو هێزی پشتیوانی بۆ نارد و نامەیەکیشی بۆنووسی کە تێیدا نوسراوە: ( من پشتگیریم کردوی بە چوار هەزار پیاو کە هەر هەزار پیاوەی کەسێکم کردووە بە سەرکردەی کە بەرامبەر هەزار پیاو دەوەستێتەوە)

ئەو چوار پیاوەی کە بوونە سەرکردەی ئەو سوپایە ئەمانە بوون: (میقدادی کوڕی ئەسوەد، عبادەی کوڕی صامت، زوبێری کوڕی عەوام، مەسلەمەی کوڕی موخلەدی ئەنصاری)

"میقدادی کوڕی ئەسوەد" ئەو هاوەڵە بەڕێزەی پێغەمبەر بوو (صلی اللهعلیه وسلم) کە لەجەنگی بەدردا بە پێغەمبەری فەرموو : ( ئەی پێغەمبەری خوا ئەمرت بەچیە پێمانبڵێ؟، سوێند بەخوا ئێمە وەک بەنو ئیسرائیل نابین کە بە موسایان وت تۆو خواکەت بڕۆن بجەنگن ئێمە لێرە دەمێنینەوە، بەڵکو ئێمە دەڵێین: تۆو خوا کەت بجەنگن و ئێمەش لەگەڵتانا دێین و دەجەنگین) پێغەمبەر (صَلَّى اللّٰه عَلَيْـهِ وَسَلَّمَ) موژدەی خێریدا کەئەم قسەیەی بیست.

وە "عبادەی کوڕی صامت" یەکێک بوو لەو کەسانەی کە بەشداربوو لە کۆکردنەوەی قورئانی پیرۆز لە سەردەمی پێغەمبەردا (صَلَّى اللّٰه عَلَيْهِ وَسَلَّمَ).

وە "زوبێری کوڕی عەوام" نازناوی حەواری پێغەمبەر(صَلَّى اللّٰه عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وەرگرتبوو.

وە "مەسلەمەی کوڕی موخلەد" کەسێکی وەک "موجاهید" کە ئیمامی موفەسیرینە دەربارەی دەڵێ: (لەدوای مەسلەمەی کوڕی موخلەد کەسم نەدیووە لەو باشترو چاکتر قورئانی لەبەر بوبێت، سورەی "البقرة" ی دەخوێند بەبێ ئەوەی (واوێک) یان (ئەلفێک) مەڵەبکات).

ئائەم پیاوە بەڕێزانە بوون برای موسوڵمانم کە بوونە سەرکردەی سوپای موسوڵمانان و وڵاتێکی وەک میصریان ئازادکرد، هەموو ئەم بەڕێزانە پیاوی ڕۆژگاری خۆیان بوون

هەڵگـری قورئـان بـوون لە سـینەیاندا، هەربەوەنـدەی کە نزیکـی پێغەمبەربـوون و لەگەڵیدا ژیابوون و هاوەڵی پێغمبەر بوون(صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) رازی نەبوون، بەڵکوو بەو پەڕی هێزو توانایانەوە هەوڵیان ئەدا بـۆ بەدەسـتهێنانی رەزامەنـدی خـوای گەورەو کۆکردنەوەی توێشوی قیامەتی خۆیان، ئەم بەڕێزانە میصریان ئازادکرد جێی خۆیەتی کە شانازیان پێوەبکەین، کام لە ئێمە هەتا ئێستا ناوەکانیانی لەبەردکردووەو بۆ خەڵکی و منداڵەکانی باسکردووە؟!

بـرای شـیرینم نـاوی ئەم پیـاوە بەڕێـزانە لەبەربـکەو بیانناسـەو وە بـۆ کەس و کـارو منـداڵەکانتی باسـبکە، بەڵکـو لەنـاو ئێمەشـدا پیـاوانی وەک ئەوانەمـان تیادروسـتبێت هەتـا ئیسـلام بە عیـزەتبکەنەوەو بیپـارێزن.لەدوای هـاتنی هێـزی پشـتیوانی لەلایەن خەلیفەوە ژمارەی سوپای موسوڵمانان بووە دوانزە هەزارکەس...

جەنگێکـی خێـرا لە "عـین شـمس" رویـدا لەنێـوان هەردوولادا، بەڵام کاتێـک هێـزی پشتیوانی گەیشت بە موسوڵمانان عەمری کوڕی عاص ئاڕاستەی سوپاکەی برد بەرەو قەڵای بابلیون و نزیکی مانگێک گەمارۆیدا، کاتێک گەمارۆکە زۆری کێشاو خەڵکی ناو قەڵاکە لە برسـێتی و تونێتیـدا هاواریـان لێ بەرزبـۆوە، مـقەوقەس نـامەیەکی نـارد بـۆ عەمری کوڕی عاص و تیایدا نووسی: (ئێوە میللەتێکن کە هاتونەتە سەر شارەکەمان و دەتـانەوێ جەنگمـان لەگەڵ بـکەن، وە مانەوەشـتان لێرە زۆری کێشـا، ئەگەر ئێـوە پێـداگربن لەسـەر ئەم کـارە، ئەوا بەدڵنیـایەوە رۆم دێـت و ئامـادەی خـۆی دەردەبـڕێ بۆمـان بە چەک و هێز پشـتیوانیمان دەکـات، وە بەدڵنیـایەوە هێزی رۆم هەمـوو نیـل دادەپۆشێ، ئەگەر ئێـوە لەسـەر ئەم کارەتـان بەردەوام دەبـن، ئەوا پیاوێـک لە خۆتـان

بنێرن بۆ لامان هەتا گوێ لە داواکاریەکانمان بگرێت بەڵکو لەسەر شتێک رێکبکەوین کە بۆ هەردوولامان باش بێت و پێمان خۆشبێت، وە ئەم جەنگ و کوشتارەش کۆتای پێبێت، پێش ئەوەی سوپای رۆم بێت کە هەردوولامان زەرەرمەند دەبین بە هاتنی رۆم، جا داواکارم کە کەسێک بنێرن بۆ لامان هەتا رێکەوتن بکەین لەسەر چەند خاڵێک پێش ئەوەی پەشیمانی بچێژن لەدواتردا).

کاتێک نێردەرەکەی مقەوقەس هات بۆ لای عەمری کوڕی عاص و ئەم پەیامەی پێدا، عەمر بۆ ماوەی دوو ڕۆژ بەندیکرد لایخۆی، پاشان نامەیەکی نارد بۆ مقەوقەس پیایدا و تیایدا نووسی: (لەنێوان ئێمەو ئێوەدا لەم سێ رێگایە هیچیتر نیە: یەکەم :- یان دێنە ناو ئیسلامەوەو موسوڵمان دەبن، ئەوکات دەبنە برامان و وەک ئێمەتان لێدێ، دووەم:- یان لەسەر دینی خۆتان بەردەوام دەبن بەڵام جزیەمان ئەدەنێ، جزیەکەش لەبری ئەوەیە کە ئێمە دەبینە بەرگری کاری ئێوەو خۆشمان، وە ساڵانەش زەکات نادەن و بەشداری جیهاد ناکەن بۆ بەرگری کردن لە خاکەکە بەڵکو ئێمە زەکات ئەدەین و جەنگیش دەکەین لە پێناو پاراستنی ناوچەکە، سێیەم:- وەیان جەنگتان بەرامبەر دەکەین و هێرش دەکەینە سەرتان هەتا خوای گەورە لایەکمان سەردەخات بەسەر ئەویتردا).

کاتێک نێردەرەکەی مقەوقەس گەڕایەوە لای عەمری کوڕی عاص و نامەکەی خوێندەوە بۆ مقەوقەس، ئەویش لێی پرسی کە تۆ لەوێ بویت ئەو دووڕۆژە هەڵوێستت چیە لەسەر ئەم کەسانە؟

کابرای نێردەر وتی: (من قەومێکم بینی کە مردن لەلایان خۆشترە لەژیان، کەسی خۆبەکەم زان لەلایەن خۆشەویسترە لەهەموو کەس، هیچ کام لەوانە کۆڵی دونیاو حەزو ئارەزوو خۆشی دونیا نایان جوڵێنێ، ئەوانە لەسەر خۆڵ دەخەون و دادەنیشن، لەسەر ئەژنۆ نان دەخۆن، ئەمیرێکیان هەیە وەک خۆیانە و هیچی زیاتر نیە لەوان).

پاشان مقەوقەس داوای کرد و پێداگری کرد لەسەر عەمری کوڕی عاص کە نوێنەری خۆیان بنێرن هەتا رێکبکەون لەگەڵیاندا، عەمری کوڕی عاص دە پیاو لە پیاوە چاکەکانی نارد، وە "عبادەی کوڕی صامت"ی کرد بە سەرکردەیان، عبادە پیاوێکی رەنگ ئەسمەری تۆخ و باڵایەکی بەرزی هەبوو، کاتێک نوێنەرەکان چوونە لای مقەوقەس عبادە پێشەکی دەستیکرد بە قسەکردن، مقەوقەس بەرەنگە رەشەکەی عبادە ترسا و وتی: ئەم رەشە نوێنەرتانە؟!.

نوێنەرەکان کەلەگەڵ عبادە دابوون وتیان: ئەم رەشەی تۆ دەیڵێی باشترین کەس و زاناترین کەسمانە، ئەمەش ئەمیرەکەمان دایناوەو ئێمەش بێ فەرمانی ئەمیرەکەمان ناکەین، مقەوقەس وتی: ئێ ئێوە چۆن رازی دەکرێن کە ئەم رەشە باشترین و زاناترینتان بێت؟ وتیان: ئەم رەشە دەم راستمانەو واش دەمێنێتەوە.

مقەوقەس بە عبادەی وت: فەرموو ئەی رەش قسەکانت بکە بەس بە نەرم و نیانی، چونکە من لە رەشیەکەت دەترسم و ئەگەر بەدەنگێکی بەرزیش قسەبکەیت ئەوا زیاتر دەمترسێنێ.

عبادە وتی: قسەکانی ئێمەت گوێلێبوو، مەبەستەکەی ئێمە دیارو ئاشکرایە ئەو سێ خاڵەت لەبەردەستدایە، وە ئەوەش بزانە لە سوپاکەی ئێمەدا هەزاران کەسمان

لەگەڵـدایە کە لەمـن ڕەشـترو لەمـن ترسـناکترن، ئەگەر بیـان بینی ئەوا منـت زۆر لا ئاسایی دەبێتەوە، گفتوگۆی نێوان مقەوقەس و عبادە کۆتای هات بەم شێوەیە کاتێک باسی سێ خاڵەکەی بۆ کرد، مقەوقەس پێشنیارەکانی ڕەتکردەوەو جەنگی هەڵبژارد.

جەنـگ دەسـتی پێکـرد و بێبـاوەڕان گومانیـان وابـوو کە سـەرکەوتن بەدەسـت دەهێـنن، چـونکە قەڵاکەیـان زۆر بەلاوە بەهێزبـوو وە شـورای قەڵاکە زۆر بەرزبـوو پاشـان دەوری قەڵاکەش بـا ئـاو دەورە درابـوو وە دەرگـایەکی زۆر تۆکمەشـی هەبـوو قەڵاکە، ئیتـر گومانیان وابوو کە موسوڵمانان ناتوانن قەڵاکە داگیربکەن.

بەڵام موسـوڵمانان توانیـان بچـنە قەڵاکەوە سـەرەڕای ئەو هەمـوو ڕێگـریەش، زوبێری کـوڕی عەوام تـوانی لەگەڵ هاوەڵێکیـدا بەمەلەکـردن بـگەنە لای شـوراکە و پاشـان بەسەریدا سەربکەون و دەرگاکە بکەنەوە، موسوڵمانانیش بەهەڵمەتێکی زۆرەوە چونە ناو قەڵاکەو دەستیانگرت بەسەرید لەدوای ئەوەی حەوت مانگ گەمارۆیاندابوو.

مقەوقەس بێجگەلە خۆبەدەستەوەدان هیچ چارەیەکی بۆ نەمایەوە، هەربۆیە داوای کرد لە عەمری کوڕی عـاص کە ڕێکەوتنیـان لەگەڵدا بکات، ئەویش ڕێکەوتنی لەگەڵ کردن و پەیمان نامەیەکی نووسی بۆیان کە تیادا نوسرابوو:-

((بسم الله الرحمن الرحيم... ئەمە پێدانی ئەمانە لە عەمری کوڕی عاصەوە بۆ خەڵکی میصـر، ئەمـان دراوە بە خەڵـکەکە و بە مـاڵ و سـامانیان وە بە کەنیسـەو سـەلیب و حیبرو ڕاهیبەکانیشـیان، هیچ شـتێک زیـاد لەمـانە نـاگرێتەوەو وە کەمیشی نابێـت، ئەو کەسـانەی کە جــزیە نــادەن لە خەڵکــی خانەدانەکــان و خەڵکـی میصــر نــاتوانن لێرەبمێنەوەو بەبێ پێدانی جزیە، ئەگەر خەڵکانی ڕۆم یان خانەدانەکان هاتنە ناو ئەم

ڕێکەوتن نامەیەوە ئەوا هەمان مافی خەڵکانی تریان هەیە، ئەگەریش ویستیان بڕۆن و ئێرە جێبهێڵن ئەوا ئەمانیان ئەدەینێ هەتا لێرە دەردەچن، ئەم ڕێکەوتن نامەیە بەڵێنی خـوای گەورەو پێغەمـبەرەکەی و خەلـیفەی موسـوڵمانان و موسـوڵمانان دەبێـت و پێوەی پابەند دەبن)).

مقەوقەس بە عەمری کوڕی عاصی ڕاگەیاند کە ئەم ڕێکەوتن نامەیە هەرقل گەورەی ڕۆم پێی خـۆش نابێـت و پێشـی ڕازی نابێـت، وە مـن : ( بەم ڕێکەوتـن نـامەیە خۆشـم و ئەوەی لەگەڵـمە پێـوەی پابەنـد دەبین ئەمما ڕۆم ئەوە ئێمە لێی بەرپرس نـابین) عەمری ڕازی بوو لەسەر ئەو قسانە.

## ئازادکردنی ئەسکەندەریە مانگی موحەرەم ساڵی "٢١" هیجری

پاشان عەمری کوڕی عاص ویستی کە بەرەو ئەسکەندەریە بچێت و ئازادی بکات، بۆ ئەمە داوای لە خەلیفەکرد کە ڕێی پێبدات و خەلیفەش ڕێگەی پێدا، ڕێگای ڕۆیشتن بەرەو ئەسکەندەریە ئاسان نەبوو چونکە بەدرێژای ڕێگەکە سوپای ڕۆم بونی هەبوو، بەڵام عەمر و سوپاکەی گوێیان بەو بەربەستانە نەداو بەڕێکەوتن بەرەو ئەسکەندەریە، گەمارۆی ئەسکەندەریەیاندا بۆماوەی سێ مانگ، هەندێک دەڵێن کە چوارده مانگی خایەندووە هەتا عومەی کوڕی خەتاب تەواو توڕەو بێتاقەت بووە بەم چاوەڕوانیە، خەلیفە نامەیەکی توند دەنێرێ بۆ عەمری کوڕی عاص و دەڵێ: (هیچ شتێک ئەم ئازادکردنەی دوانەخستووە گوناح و تاوانی خۆتان نەبێ، بگەڕێنەوە بۆلای خوای گەورەو نەفسی خۆتان پاک بکەنەوە لە حەزو ئارەزوی دونیا)

پاشان لەوماوەدا هەرقل دەمرێ و بەمردنی هەرقلیش پشتیوانی نامێنێ بۆ بێباوەڕان، هەربۆیە موسوڵمانان دەکەونە خۆیان و هێرش دەکەنە سەر ئەسکەندەریەو ئازادی دەکەن.

**دیمەنەکانی ئازادکردنی میصر و ئەسکەندەریە:-**

❖ عەمری کوڕی عاص ئاڵاکەی دابە "وردان"، کردیە پێش کوڕەکەی خۆی "عبداللە"ەوە، عبداللە لەو جەنگەدا زۆر بە خەستی برینداربوو، هەتاوەکوو خوێن سەرتاپای جەستەی داپۆشی بوو، کاتێک برینەکەی زۆری بۆهێنا وتی: ئەی "وردان" ئەگەر نەگەڕێیتە دواوە ئەوا بەم نزیکانە مردن دەتگاتێ، "وردان" وتی: روح لە پێشەوە

دەدرێ نەک لە دواوە مەبەستی ئەوە بوو کە دەبێ لەبەری پێشی جەنگدا بمری نەک لە دواوە.

عبداللە کە گوێی لەم قسانەی "وردان" بوو دڵی پڕجۆش بوو وە کەوتەوە سەرپێ زۆر بە بوێرانە بەرامبەر دوژمن وەستایەوە، کاتێک عەمر بەوەی زانی کە کوڕەکەی بریندارە، کەسێکی نارد مەتا بزانێ حاڵی عبداللە چۆنە، کاتێک کە نێردەرەکە گەڕایەوە بۆ لای عەمر و پێی وت کە هەڵوێستی کوڕەکەت لە جەنگ و برینداربونیدا زۆر بەرز و ئازایانەبووە، عەمر وتی: ئەوە کوڕی راستەقینەی منە.

❖ لەدوای ئەوەی کە خوای گەورە سەرکەوتنی بەخشی بە موسوڵمانان بۆ ئازادکردنی ئەسکەندەریە، عەمری کوڕی عاص نێردەرێکی نارد بۆ لای عومەری کوڕی خەتاب مەتا موژدەی ئازادکردنی ئەسکەندەریەی پێبڵێ، "موعاویەی کوڕی حودیج" کە نێردەری عەمری کوڕی عاص بوو بۆ لای خەلیفە چیرۆکی رۆیشتنەکەیمان بۆ دەگێڕێتەوە و دەڵێ:

((لەکاتی نوێژی نیوەڕۆدا گەیشتمە مەدینە، لە بەردەم دەرگای مزگەوتەکە خەڵکی کۆبوبونەوەو منیش لەنێوانیاندا دانیشتبووم، خزمەتکارەکەی خەلیفە لەماڵی خەلیفە دەرچووەدەرێ و کاتێک گەیشتەلای ئێمە سەیری منی کرد کە جلوبەرگ و شێوەم هی کەسێکە لە سەفەرەوەماتبێ، هاتەلام و پرسی تۆ کێی؟ وتم: من "معاویەی کوڕی حودیج" نێردەری عەمری کوڕی عاص، رۆیشت و دواتر زۆر بە خێرای گەڕایەوە دەنگی جلەکانی کە ئەیدا لە قاچی دەگەیشتەلای من هی ئەوەبوو زۆر بەپەلە دەڕۆیشت، کاتێک گەیشتەلام وتی: مەستە ئەمیری موسوڵمانان دەیەوێ بتبینێ، منیش بەشوێنیدا

ڕۆیشـتم کاتێـک چـوومە ژوور عـومەری کـوڕی خەتـاب عەبـای سەرشـانی گرتبـوو بەدەستیەوەو فەرمووی: چی هەیە؟

وتم: خێردەبێت ئەی ئەمیری باوەڕداران، ئەسکەندەریە ئازادکرا...

لەگەڵی چوومەدەر بۆ مزگەوت بە بانگ بێژەکەی وت: خەڵکی بانگ بکە بۆ نوێژی بەکۆمەڵ، خەڵکی کۆبونەوە لە مزگەوت، پاشان خەلیفە پێی وتم: هەستە چی رویداوە بەو خەڵـکەی رابـگەیەنە، پـێم وتـن، پاشـان نوێژمـان کـرد و چـوینەوە بـۆ مـاڵێ و وە بانگهێشـتی کـردم بـۆ نـانخواردن، پاشـان دانیشـتین و بـانگی خزمەتکارەکەی کـرد کە خـواردن بهێنێ، ئەویـش نـان و زەیتی هێنـا، وتـی: بخـۆ، منـیش زۆر بەشـەرمەوە نـانم خوارد، پاشان وتی: ئەی موعاویە کاتێک هاتیتە ناو مزگەوت چیت وت؟

وتم: ئایە ئەمیری موسوڵمانان بەم کاتی نیوەڕۆیە خەوتووە!

عـومەر وتی: قسـەیەکی خراپت وتـووە، ئەگەر بە بەیانیـان بخەوم ئەوا خەڵـکەکەم لەدەسـت دەردەچێـت، وە ئەگەر بە شـەو بـخەوم ئەوا نەفسـی خـۆمم لەدەسـت دەردەچێت، لەبەرئەوە من کەی بخەوم ئەی موعاویە؟

❖ خەڵکی میصـر کاتێـک موسـوڵمانان هـاتنە ناوچەکەیـان، بە بینینی رەفتـاری جـوانی موسـوڵمانان بەتـایبەت مەسـیحیە ئەرسۆدۆکسـیەکان کە پێشـتر لە ژێـر ئەشـکەنجەو ئـازاری مەسـیحیە کاسـۆلیەکیەکاندا بـوون کە هەر رۆمـیش بـوون، زۆر دڵخۆشی خۆیـان دەردەبڕی بە رزگاربوونیـان لە دەسـت رۆمیەکان کە هـاو دینی خۆیـان بـوون، هەتـا بەطریـرک کە گەورەی مەسـیحیە ئەرسۆدۆکسـیەکان بـوو ئەو رۆژانە بە رۆژانێکی زۆر گرنـگ دەزانێ کە لەدەست خەڵکانێـک رزگاریـان بووە کە هـاودینی خۆیـان بـووە بەڵام بە هۆکـاری جیـاوازی مەزهەبیـانەوە چەوسـێنراونەتەوە، بـۆیە هـاتنی

موسـوڵمانان و پێدانی ئەمان لە لایەن عەمری کوڕی عاصـەوە بە ڕۆژێکی زۆر گرنگیـان زانییوە.

❖ یەکێکیتر لەو دیمەنـانەی کە لە ماوەی ئـازادکردنی میصـردا جێی سـەرنج بـووە بریتیەلەو قیبطیەی کە لەژێر سایەی ئیسلامدا بووە، مێژوو نوسانە بۆمان دەگێڕنەوەو دەڵێن:

ئەنەس دەگێـڕێتەوە: ئـێمە لە لای عـومەری کـوڕی خەتـاب بـووین، پیاوێـک هـات کە خەڵکـی میصـر بـوو وتـی: ئەی ئەمیـری موسـوڵمانان، هـاتووم پەنامبـدەی و حەقـم وەرگری، عومەر وتی: چی بووە؟

کابرا وتی: لە پێشبڕکێیەکی ئەسپ سواریدا من بردمەوە لە محمد ی کوڕی عەمری کوڕی عـاص، کاتێـک بـردمەوە وتـم سـوێند بەخـوا مـن پێشـکەوتم، بەڵام ئەو لەبەرچـاوی خەڵکەکە قامشیەکی پێدام و وتی: بگرە من کوڕە ڕێزدارم، ئەم کارە دزێوەم بە عەمر وت، بەڵام ئەو منی سجن کـرد و پاشـان بەریـدام و ئەوە ئێسـتاش مـن هـاتوم کە مـافی خۆمم بدەیتەوە.

عـومەر توڕەبـوو بە کابرای وت دابنیشـە، وە نـامەیەکی نـارد بـۆ عەمـری کـوڕی عـاص و تیایـدا نوسـی: ئەگەر ئەم نـامەیەت خوێنـدەوە خـۆت و محمد ی کـوڕت وەرن بـۆ ئێرە، بە کابرای میصریشی وت بمێنەوە هەتا ئەوان دێن.

عەمری کوڕی عاص و کوڕەکەی هاتن.

ئەنەس دەڵێ: سـوێند بەخـوا ئێمە لای عـومەر بـوین، کاتێـک عەمـرو کـوڕەکەی هـاتن، عـومەر قامشـیەکەی بەدەسـتەوە بـوو وتـی: کـوڕەکەت لەکـوێیە؟ لەپشـت عەمـرەوە وەستابوو.

عـومەر بینی و وتـی: کـوا کـابرای میصـری؟ وتـی: ئەوەتـام، عـومەر وتـی: وەرە ئەوە قامشیەکەیەو بیکێشە بە کوڕی ڕێزداردا، ئەویش پیای کێشا هەتا برینداری کرد، ئێمە داوامان کرد کە لێینەدا، بەڵام ئەو بە دڵی خۆی پیای کێشا، وە عومەر وتی: لێیدە لە کوڕە ڕێزدار.

پاشـان عـومەر بە کـابرای میصـری وت: بیکێشـە بە عەمریشـدا، سـوێند بەخـوا نەیدەتوانی پێتابکێشێ مەگەر ئەوەی پشتی بە باوکی قایم بووە، کابرای میصری وتی: ئەو کوڕەکەی پێیدا کێشام منیش حەقی خۆمم لە کوڕەکەی کردەوە ئیتر کۆتای پێهات.

عومەر وتی: سوێند بەخوا ئەگەر بەردەوام بویتایە لە لێدانی کوڕەکەی عەمر ئەوا لە نێوان ئێمەو تۆودا هیچ نەدەکرا مەگەر خۆت بوەستایتایە لە لێدان دەنا ئێمە رامان نەدەگرتی...

پاشان عومەر وتی: "ئەی عەمر ئەمە لەکەیەوە خەڵکتان کردووە بە کۆیلەی خۆتان، کە خوای گەورە بەئازادی لەدایکی کردوون".

عومەر بە کابرای میصری وت: بڕۆ زۆر بە سەربەرزی و هیچ گومانێکیشت نەبێت، ئەگەر هەرچیشت هەیە بینوسە ئێمە بۆت جێبەجێ دەکەین.

ببینن ئەمە چی شتێکە وای لە کابرای میصری کردووە کە ئەو هەموو ڕێگە دوورە ببڕێ، لە میصرەوە بۆ مەدینە، ئەویش بۆ بەدەستهێنانی مافی خۆیی، لەکاتێکدا کە پێشتر لەژێر حوکمی رۆمەکاندابوون هەرچی زەلیلی و نارەحەتی بوو دەیان چێشت بەدەست ئەوانەوە، بەڵام ئیسلام کەهات باوەشی ئازادی و ماف و یەکسانی بۆ هەموو کەس گەڕاندەوە، ئائەمەشە وای لەو پیاوەکردووە کە دڵنیابێت لەوەی خەلیفە مافی بۆ وەردەگرێت، دکتۆر "عبدالصبورشاهین" بەم شێوەیە باس لە گوزەرانی خەڵکی میصر

دەکات لە کاتی حوکمڕانی رۆمەکاندا: ((ئەگەر چاوبخشێنینەوە بەو سەردەمەی کە خەڵکی میصر لەژێر حوکمڕانی رۆمەکاندا دەژیان، ئەوا دەبینین کە چی زوڵم و ستەمێک کراوە بەرامبەر بە گەلی میصر، لەکاتێکدا قەیسەری میصر ئامادەی هەموو هاوکاریەکی رۆمەکانی دەکرد لە کاتی تەنگانەدا))

هەروەها دکتۆر (حسن ابراهیم) دەڵێت: ((لە سەردەمی حوکمڕانی رۆمەکاندا ئاستی رۆشنبیری و زانست لەناو میصریەکاندا زۆر هاتبووە خوارێ، هەروەها هەرچی پلەو پۆستێک هەبوایە لەناو میصردا ئەوا خەڵکی میصری لێ بێبەشدەکراو هیچ دەرفەتێکیان نەئەدا بە خەڵکی میصر، وە نرخی باج لەسەر خەڵکی میصر زۆر زیاد کرابوو هەتا ئەگەر کەسێکیان بمردایە ئەوا بۆئەوەی بینێژن دەبوو باج بدەن بە رۆمەکان، لەکاتێکدا خەڵکی میصر خاوەنی خاکەکەبوون...))

مێژوو نوسی رۆژئاوای "گوستاف لوبون" کە خاوەنی کتێبی (حضارة العرب)ە سەرسوڕمانی خۆی پیشان ئەدا لەسەر ئەو کاتەی کە موسوڵمانان میصریان ئازاد کردو گەلی میصر هەڵوێستیان چۆن بووە بەرامبەر موسوڵمانان و دەڵێت:-

((هەرچەند زیاتر بگەڕێینەوە بۆ مێژوو دەبینین کە گەلی میصر بە درێژای مێژوو خاوەنی شارستانیەت بووە، لەبەر ئەوە ئاسان نەبووە بۆ گەلی میصر خەڵکی بێگانە قبوڵبکەن و بێتە ناویانەوە، بەڵام کاتێک موسوڵمانان هاتن بۆ میصرو ئازادیانکرد ئەو گەلە بەهێزە لەشوێن خۆیان مانەوەو هەڵوێستی بەرەنگاریان نەگرتەبەر، لەو سەردەمانەشی کە ئیغریقیەکان و رۆمەکان حوکمی میصریان کردووە نەیان توانیووە کاریگەری لەسەر گەلی میصر دابنێن، ئەگەر سەیری کەلتوری میصر بکەین لە

شێوازی ژیانیان و کاری بیناسازی ئەوا دەبینین کە میصر خاوەنی شارستانیەتی خۆی بووە و زۆریش سەربەخۆ ژیاون، بەڵام بە هاتنی موسوڵمانان ئەو پێشوازیە گەرمەیان لێکردووە ئەمەش بەڵگەی ئەوەیە ئەو گەلە زانیویانە کە موسوڵمان چۆن حوکمی گەلانیتر دەکەن))

پاشان دەڵێت: ((هیچ شتێک نیە رامانبگرێ لەوەی کە تێبینی نەکەین، بۆچی میصری پێشوو بەرامبەر بە ئیغریق و رۆمەکان وەستانەوە بەڵام بەرامبەر بەهاتنی موسوڵمانان بێدەنگیان هەڵبژارد، وە رازی بوون بەوەی دینی عەرەب وەربگرن، وە زمانی عەرەب بەرکابهێنن، وە شارستانیەتی عەرەب قبوڵ بکەن، لەکاتێکدا لەو سەردەمەدا شارستانیەتی هیند و فارس و رۆم و ئیغریقیش هەبوون، کەچی گەلی میصر بوونە شوێنکەوتەی ﷴ و وازیان لە شارستانیەتی کۆنی خۆیان هێنا کە فیرعەونەکان دروستیان کردبوون، وە وازیان لە شارستانیەتی یۆنان و رۆمیش هێنا))).

ئابەم شێوەیە گەلی میصر بوونە موسوڵمان بە بێ ئەوەی زۆریان لێبکرێت، بەڵکو زۆر بە نیەتی پاکەوە دینی ئیسلامیان هەڵبژاردو بە کۆمەڵ بونە شوێنەکەوتەی ئیسلام، هۆکاری ئەمەش بە دڵنیایەوە ئەو نەرم و نیانیەی هاوەڵان بوون کە کاتێک فەتحی میصریانکرد وە رەوشت و ئاکاری ئەمیرەکان بەرامبەر بە گەلی میصر کاریگەری زۆری دروستکردبوو لەسەریان، ئەمەش فەزڵی خوای گەورەیە...

## ئازادکردنی ناوچەکانی فارس:-

لەپێشتردا باسمان لەو ناوچانە کرد کە لەژێر حوکمڕانی عومەردا ئازادکران وەک ناوچەکانی شام، بەڵام بێجگەلە ناوچەکانی ژێردەستی رۆم لایەنێکیتریش هەن کە فارسەکان بوون، لەم چەند زنجیرە رووداوانەی کە دێت باس لەو جەنگانە دەکەین کە لە وڵاتی فارسدا رویانداوەو ئازادکراون لە سەردەستی موسوڵمانان.

سەرەتای باسکردنی رووداوەکان لە وڵاتی عێراقەوە دەستپێدەکەین کە لە ساڵی ١٢ هیجریدا لە سەردەمی ئەبوبەکری صدیقدا دەستی پێکرد، بەڵام ئەبوبەکر ئازادکردنی عێراقی راگرت و فەرمانیکرد بە خالیدی کوڕی وەلید کە عێراق بەجێبهێڵێت و بچێت بەرەو شام، خالید لەجێی خۆیی موسەنای کوڕی حاریسی شەیبانی دانا، موسەنا لە عەشرەتی بەکری کوڕی وائلە کە ئەم عەشرەتە بەربڵاوبوون بە ناوچەکانی نێوان دیجلەو فوراتدا، لەو ناوچانەدا خەریکی کاری کشتوکاڵی بوون بۆیە زۆر باش شارەزای ناوچەکە و وە شارەزای سروشتی خەڵکی فارس بوون، وە دەشیانزانی کە شێوازی جەنگکردنی فارسەکان چۆنە، لەگەڵ ئەوەشدا سەرکردەکانی بەنی شەیبان کەسانی زۆر ئازاو شارەزابوون لە کاری سەربازیدا هاوشێوەی خالیدی کوڕی وەلیدبوون...

خالید کە عێراقی بەجێهێشت نیوەی سوپاکەی لەگەڵ خۆیبرد، ئەوەی بۆ موسەنا مایەوە تەنها نۆ هەزار جەنگاوەر بوون، بۆیە موسەنا داوای هێزی پشتیوانی کرد لە مەدینە، بەڵام هێزی پشتیوانی درەنگ کەوت نەهات، ناچار موسەنا بڕیاریدا کە خۆی بچێت بۆ مەدینە بەپەلە هەتا هێزی پشتیوانی لەگەڵ خۆی بێنێت، لەجێی خۆشی بەشیری کوڕی خیصاصیەی دانا...

## عومەری کوڕی خەتاب هانی خەڵکیدا بۆ جیهادکردن بەڵام خەڵکی هەڵوێستیان دەرنەبڕی:

موسەنا گەیشتە مەدینە پێش مردنی ئەبوبەکر بەڕۆژێک، کاتێک عومەر خەلافەتی وەرگرت موسەنا داواکەی گەیاندە عومەر، عومەریش هانی خەڵکیدا بۆ جیهادکردن و ئازادکردنی خاکی عێراق لەدەست فارسەکان، بەڵام خەڵکی هیچ وەڵامێکیان نەبوو بۆ داواکەی عومەر و زۆر لەسەریان قورس بوو ئەم جەنگ کردنە....

تەبەری دەربارەی ئەمە دەڵێت:

((عەرەب بە جەنگکردن لەگەڵ فارسەکاندا زۆر نارەحەت دەبوون، چونکە دەیانزانی کە فارسەکان لەجەنگکردندا زۆر پشوو درێژو سەرسەختن، وە سەرکردەکانیشیان زۆر بەهێزو زیرەک بوون لە بواری جەنگ و سەربازیدا بۆیە فارسەکان ترس و بیمێکی زۆریان دابوو بە عەرەبەکان، هەڵوێست وەرگرتن بۆ جەنگ دژی فارسەکان ئاسان نەبوو بۆیان))

موسەنا چووە ناو خەڵککەو باسی لاوازی فارسی بۆکردن، بەڵام بێ سود بوو خەڵکەکە هیچ وەڵامێکیان نەبوو، هەتا چوار رۆژ موسەنا ئاوا قسەی بۆ خەڵکەکە دەکرد بەڵام سودی نەبوو، هەتا عومەر چووە ناو خەڵکەکەو قسەی زۆر کاریگەری بۆ کردن دەربارەی فەزڵی جیهاد و شەهیدی، لە کۆتای قسەکانیدا عومەر وتی: ((ئەرێ بەندە صاڵحەکانی خوای گەورە لەکوێن)).

پیاوێک لەناو هاوەڵاندا کەناوی "ئەبو عوبەیدەی کوڕی مەسعودی سەقەفی" بوو هەستاو وتی: (من ئەوم)، ئیتر خەڵکی بەم قسەیە هەستیان جوڵا، ژمارەیەک

موسـوڵمان ئامادەییـان دەربـڕی بـۆ جیهـادکردن  کە نزیکی هەزار کەس دەبـوون، ئەم ژمـارە زۆرەش جێی سـەرسـوڕمانە بەڕاسـتی لە مـاوەیەکی کەمـدا حازربـبێـت، دەتـوانین هۆکاری ئەم هەڵوێستە بگەڕێنینەوە بۆ دووخاڵ :

**یەکەم**: بەرەی دوژمـن کە کافرەکـان بـوون زۆرێـک لە سـەرکردەو گەورەکانیـان هـاتبونە نـاو هێزەکـانی جەنـگەوە کە ژمـارەی سـەربازی موشـریکین پەنجـا هەزار دەبـوو، بـۆیە موسوڵمانانیش دەیان ویست بەهێزێکی زۆر بێنە پێش.

**دووەم**: ئەبوبەکر هەڵوێستەی دەکرد بە رامبەر ئەو کەسانەی کە مورتەد بونەوە دوای وەفاتی پێغەمبەر (صَلَّى الله عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) و تۆبەیان کردبوو، بۆیە رێی نەئەدا بەشـداری جیهـاد بـکەن، بەهەمـان شـێوەش عـومەریش کەهـاتە سـەرحوکم ئەویـش بەشـداری پێنەدەکـردن، ژمـارەی ئەو کەسـانەش زۆر بـوون، بـۆئەوەی نیشـانی بـدەن کە تۆبەکردنەکەیان راستگۆیانە کردووە زۆر حەزیان دەکرد کە بەشـداری جیهاد بکەن، بۆیە ژمارەیەکی زۆر لەم کاتەدا بە فرسەتیان زانی و بەشداریان کرد.

دەڵێن لەو کاتەدا عومەر بڕیاریدا کە ئەبو عوبەیدەی کوڕی مەسعودی سەقەفی بکاتە سـەرکردەی سـوپای گشـتی عێراق، هەندێک لە گەورە هـاوەڵان بەم بڕیارە نـاڕازی بـوون، چونکە پێیان وابوو کە ئەبو عوبەیدە هێشتا خاوەن ئەو ئەزمونە گەورەیە نیە کە ببێتە سەرکردەی ئەو سوپا گەورەیە، بەڵام عومەر پێداگری کرد لەسەر ئەوەی کە هەر ئەبو عوبەیـدە ببێـت، عـومەر وتـی ئەو یەکەمـین کەس بـوو کە ئامـادەی دەربـڕی بـۆ جیهادکردن لەکاتێکدا کەس نەبوو پێش ئەو ئەو بڕیارە بدات، ئەو بووە پێشـەنگ بـۆ هەمووتـان، پاشـان عـومەر ئامۆژگـاری کـرد و بە ئەبـو عوبەیـدەی وت: ((لەنـاو

سـوپاکەتدا هـاوەڵانی پێغەمبەری تێـدایە لەبەر ئەوە راوێژیـان پێـبکەو پرسـیان پێبکە پـێش ئەوەی هەر بڕیارێـک بـدەیت و پەلەش مەکە لە کارەکانتـا هەتـا بەجـوانی بـۆت ڕوندەبێتەوە بارودۆخەکان)).

لەگەڵ ئەوەشـدا عـومەر ئەو هەڵوێسـتەی هەی بـوو بەرامـبەر بە ئەو کەسـانەی کە مـورتەد بووبـوونەوەو دواتـر تۆبەیـان کردبـوو لەسـەری لابـردن، لەبەرئەوە ئەوانـیش هەسـتان بە بەشـداریکردن لەنـاو سـوپای موسـوڵمانانـدا هەتـا بەڕێـبکەون بەرەو وڵاتـی فارس...

هەڵوێسـتەیەک: تێبینیەکی زۆر گرنـگ کە جێی خـۆیەتی تیشـکی بخەینەسـەر ئەویـش ئەوەیە کە موسـەنا کاتێـک هـات بـۆ مەدینـە سـەرکردەی هەمـوو سـوپای عێراق بـوو، خالیـدی کوڕی وەلیـد لەجێی خـۆی دانـابوو، بەڵام کە گەڕایەوە وەک سـەربازێکی ئەبـو عوبەیـدە گەڕایەوە نـاو سـوپاکەی، کەئەمەش شـتێکی زۆر گەورەیە موسـەنا بەم کـارە هـیچ شـتێک لە دڵیـدا دروسـت نەبـوو بەڵکـو بەو پەڕی خۆشـحاڵیەوە گـوێڕایەڵی بـۆ خەلیفە دەربڕی، هۆکاری ئەمەش ئەوەیە کە ئەو پیاوە بەرێزانە تەواو یەکلابوبونەوە بۆ خوای گەورە، تەنها و تەنها مەبەستیان ڕەزامەندی خوای گەورەبوو.

## جەنگی نەماریق:

سوپای موسوڵمانان بەسەرکردایەتی ئەبو عوبەیدە کە دەگەیشتە دە هەزار کەس بەرەو سوپای دوژمن بەڕێکەوتن، یەکەمین سەرکەوتنیان تۆمار کرد بەسەر سوپای فارسدا کە ژمارەیان دەگەیشتە سەد هەزار کەس، ئەو جەنگەش ناونرا جەنگی نەماریق کە لەناوچەی عێراقدا رویدا لە ٨ شەعبانی ساڵی ١٣ هیجری، لەدوای شکانی سوپای فارس ئەبو عوبەیدە دوای سوپا هەڵهاتووەکە کەوت، هەتا گەیشت پێیان بۆ جاری دووەم جەنگ رویدایەوە لەنێوانیاندا کەئەو جەنگە ناونرا "باروسما" ئەمجارەش موسوڵمانان سەرکەوتن بەسەر سوپای فارسدا بۆ جاری دووەم، هەردوو جەنگەکە لە ساڵی ١٣ هیجریدا رویدا.

## جەنگی "الجسر" یەکەمین تێکشکان بەسەر موسوڵماناندا لەدوای ئوحود:

سوپای موسوڵمانان لە پێشڕەویدا بوون، بەڵام سوپای فارسیش لەدوای ئەو تێکشکانەی بەسەریاندا هات جارێکی تر خۆیان رێکخستەوە لەژێر سەرکردایەتی کەسێکی لێهاتودا کەناوی بەهمەن بوو، سوپای فارس بەهێزێکی زۆرەوە هاتن، لەگەڵ خۆشیاندا فیلیان هێنا بوو کە سەربازی لەسەربوو، فارسەکان لە رۆژهەڵاتی روباری فوراتەوە بوون و وە سوپای موسوڵمانانیش کەوتبونە رۆژئاوای روبارەکە، لەپشتی موسوڵمانانەوە بیابانێکی گەورەو فراوان هەبوو کە دەتوانرا هێزی پشتیوانیان بۆ بنێرێت لە جەزیرەی عەرەبیەوە.

بەهەمەن نامەیەکی نارد بۆ ئەبو عوبەیدە و تیایدا نووسی: (یان ئێوە بپەڕنەوە بۆ ئەمبەرو ئێمە رێتان پێ ئەدەین تا تێدەپەڕن، یان ئێمە دێینە ئەوبەرو ئێوە رێمان پێبدەن))

ئەبو عوبەیدە راوێژیکرد بە دەوروپشتەکەی کە چیبکەن باشە، هەموویان پێیان باش بوو کە نەچنە ئەوبەر و وتیان: (ئێمە بچینە شوێنێک کە ئەوان بۆمان دیاری دەکەن و پاشان لەکاتی پەرینەوەدا ئەکەوینە ناو نارەحەتی و هیلاکەتەوە)

بەڵام ئەبو عوبەیدە سوربوو لەسەر ئەوەی کە ئەمان بپەڕنەوە بۆ دوژمن و وتی: (ناگونجێت ئەوان لەئێمە ئازاتربن بۆ مردن بەڵکو ئێمە دەپەڕینەوە بۆیان)

ئەبو عوبەیدە بڕیاریدا کە بپەڕنەوە و لەسەر پردەکە وەستاو سوپاکەی پەڕاندەوە.

بەهمەن بەم هەواڵە زۆر دڵخۆش بوو کە موسوڵمانان بڕیارياندااوە ئەوان بێنە ئەوبەر، ئەوەی ئەو دەیوست ئەوەبوو کە چاوەڕێی دەکرد، بەهمەن هەربەوەوە نەوەستا بەڵکو ئەو شوێنەشی دیاریکرد کە تیایدا بگات بە موسوڵمانان بۆ جەنگکردن، کەناری رۆژهەڵاتی روبارەکەی دیاریکرد کە شوێنێکی زۆر تەسک و نەشیاوبوو، هەروەها شوێنەکەش دەکەوتەنێوان دوو ئاوەوە لە روباری فورات لەسەر شێوەی پیتی U ئینگلیزی واتە سوپای موسوڵمانان کەوتنە شوێنێکەوە کە هەردوولاو پشتیان ئاو بوو...

لە ٢٣ شەعبانی ساڵی ١٣ هیجریدا جەنگ دەستیپێکرد، سەرەتا فارسەکان هێرشیان برد بۆ سەر موسوڵمانان بەنیازی ئەوەی کە کۆتای بە موسوڵمانان بهێنن، ئەسپی موسوڵمانان بە بینینی فیلەکان زۆر ترساو شڵەژان، ریزەکانیان تێکەڵ بوون، بۆ

ئەوەی کاریگەری فیلەکان کەم بکەنەوە موسوڵمانان دابەزین لە سواری ئەسپەکانیان و لەسەر پێی خۆیان دەستیانکرد بە جەنگ کردن، هەتا نیشانی فارسەکانی بدەن کە چەکی دەستی ئەمان کاریگەرترە لە فیلەکانی ئەوان، ئەبو عوبەیدە بۆ ئەوەی کاریگەری فیلەکان کەم بکاتەوە لە جەنگەکەدا فەرمانیکرد بە موسوڵمانان کە دەوری فیلەکان بدەن و هەوڵبدەن ئەو پەتانە بپسێنن کە کۆڵەپشتی فیلەکەی پێوە بەندە بۆئەوەی ئەو سەربازانەی لەسەر پشتی فیلەکەن و فیلەکە ئاراستەدەکەن بکەونە خوارێ، بەڵام فیلەکە ئەوەی لێی نزیک دەبۆوە شەهیدی دەکرد، چەندین کەس هەوڵیان ئەدا کە ئەوکارە بکەن هەتا نزیکی شەش کەس لە سەرکردەکانی قەبیلەی سەقیف شەهیدبوون لەم کارەدا، هەموو هەوڵیاندا کە فیلە گەورەکە لەناو بەرن بەڵام فیلەکە هەموویانی شەهید دەکرد، هەتا ئاڵاکە درایە دەست موسەنای کوڕی حارسەی شەیبانی.

موسەنا فەرمانیکرد بە سوپاکە کە بەسەر پردەکەدا بپەڕێنەوەو شوێنەکە بەجێ بهێڵن، چونکە لەم جارەدا موسوڵمانان بەهەموو پێوانەیەک زەرەرمەندبوون و دەورەدرابوون، بەڵام کەسێک لە سەقیفیەکان ئەم کارەی زۆر پێناخۆش بوو بۆیە توڕەبوو وە پردەکەی پچڕاند و هاواری لە خەڵکەکەکرد : (مردن سەربەرزانەترە هەروەک ئەمیرەکانتان، یان رابکەین و دوژمن بە ئاواتی بگات)

خەڵکەکە هەمووی سەرسام وەستان و سەیری ناو مەیدانی جەنگەکەیان دەکرد و وتیان: ( بەدڵنیایەوە سوپای موسوڵمانان لەناو دەچێت و کۆتای پێدێت) ئیتر موسوڵمانان لە شڵەژان و پەرێشانی و بێ ئومێدیدا خۆیان هەڵدایە ناو روبارەکە کە

بەڵکو بە مەلەکردن رزگاریان ببێت، بەڵام نزیکی دوو هەزار کەس لەناو ئاوەکەدا شەهیدبوون، موسەنا و گروپێک لە هاوەڵان هەوڵیان ئەدا کە پردەکە چاک بکەنەوە هەتا خەڵکەکە بەسەر پردەکەدا بڕوات نەک خۆی هەڵبداتە ناو ئاوەکەوە،

گروپێک هەوڵیان ئەدا کە پردەکە چاک بکەنەوەو گروپێکی تریش لەجەنگدا بوون دژی کافران، هەتا ئەوانیتر سەرقاڵی چاکردنەوەی پردەکە بن، کاتێک فارسەکان بەمەیان زانی هەموویان کۆبونەوە لای پردەکە هەتا نەهێڵن چاکی بکەنەوە، بەڵام موسوڵمانان سەرکەوتوبون لە چاکردنەوەی پردەکە و موسەنا لەگەڵ گروپی بەرگریدا لەبەردەم پردەکەدا وەستان هەتا هەموو موسوڵمانان تێپەڕن بەسەر پردەکەدا، هیچ کەس نەمایەوە بێجگەلە موسەنا خۆی نەبێت، کە بەشێوەیەک برینداریان کردبوو کەمێکی مابوو بمرێ، هەر بەهۆی ئەو برینداریەشەوە لەدوای دوومانگ دەمرێت، بەو هەموو نارەحەتی برینداریەشەوە بەسەر پردەکەدا تێدەپەرێ و دەگات بە هاوڕێکانی، ژمارەی شەهیدەکان لەم جەنگەدا گەیشتە (٤٠٠٠) چوار هەزار کەس، ئەمە یەکەمین و کۆتا تێکشکان دەبێت بەدەست فارسەکان.

سوپاکە دەگەڕێنەوە بۆ مەدینە بە دڵێکی تێکشکاو هەستێکی بریندار و لۆمەکردنی خۆیان، ئەوەی لەگەڵ موسەنادا گەڕایەوە ژمارەیان (٣٠٠٠) سێ هەزار کەس بوون، ئەو تێکشکانەش لەسەر دڵیان قورس بوو بەڵام بەو هەموو نارەحەتیەشەوە ئامادەبوون جارێکیتر بچنەوە جەنگ.

کاتێک گەیشتنەوە شاری مەدینە خەڵکی شارەکە کەوتنە تانەو تەشەر لێیان و بە خەڵکانی هەڵهاتوو ترسنۆک بانگیان دەکردن هەروەک رۆژی موئتە، بەڵام عومەر

بانگی موسوڵمانانی کرد و وتی: ( ئەی بەندەکانی خوا بێ ئومێد مەبن، پاشان دۆعای کردو وتی: خوای گەورە هەموو موسوڵمانان لە تەنگانەو نارەحەتیدان، منیش بەشێکم لە موسوڵمانان، هەرکەس بەرامبەر دوژمن ببێتەوەو لێمان جیاببێتەوە بەهەر هۆکارێک ئەوا منیش لەو کەسانەم) پاشان وتی: (رەحمەتی خوای گەورە لە ئەبو عوبەیدە ئەگەر لەپەڕینەوەکەدا پشتی بە بەرزایەک ببەستایە یان داوای لە ئێمە بکردایە ئەوا ئێستا شەهید نەدەبوو، بەڵام ئەو جوامێرو ئازابوو ئەوەی توانیکردی و ئەو بەشێکە لەئێمە))

سوپاس بۆ خوای گەورە کە فارسەکان نەهاتن بە دوای موسوڵماناناو وەستان لەجەنگەکەدا، ئەگەر دوای موسوڵمانان بکەوتنایە ئەوا ئێستا هەموویانیان شەهید کردبوو، ئەمەش فەزڵی خوایە کە ئاوا رزگاریان بوو، چونکە ژمارەی فارسەکان بە بەراورد بە موسوڵمانان زۆر زیاتر بوو، بەو سەرکەوتنە بەسەر موسوڵماناندا کە هێنایان پێی زۆر دڵخۆش بوون بۆیە لێگەڕان موسوڵمانان بڕۆن، ئەمەش دیارە وەک ئەوەی کە زۆر تامەزرۆی ئەو سەرکەوتنە بوون هەتا ئەو تێکشکانەی بەسەریان هاتبوو بەمە دەرونیان بەرزبکەنەوە...

**تۆڵە سەندنەوەی شێرە بریندارەکە:-**

موسەنا بریندار بونی نەبووە هۆکاری وەستانی وە ئەوانەی هەواڵ و زانیاریان لەسەر فارسەکان کۆدەکردەوە نەوەستان و ساردنەبونەوە وە موسوڵمانان بە بریندار بون و نارەحەتیان کۆڵیان نەدا، هەواڵگیریەکانی موسوڵمانان هەواڵیان پێگەیشت کە چەند سەرکردەیەکی فارس لەگەڵ سەربازەکانیان دەرچون بۆ چاودێری کردنی سوپای

موسـوڵمانان لەنـاوچەیەک بـوون بەنـاوی "الـیس" کەدەکەوتە ڕۆژئـاوای ڕوبـارەکەوە، موسـەنا لەگەڵ کۆمەڵێـک لە سـەربازەکانی دەرچـوون بۆیـان و دایـان بەسـەریاندا و لەناویانبردن، بەمەش توانیان ترسێکی نوێ بخنە دڵی فارسەکانەوە.

عـومەری کوڕی خەتاب کەوتە کۆکردنەوەی سـوپا بۆ ڕزگاکردنی ناوچەکانی فـارس هەتا هێزی پشـتیوانی بنێرێ بـۆ موسـەنا، بـۆئەمەش بڕیاریـدا کە لەسـەر خەڵـکەکە واجـب بکات  بەشداری جیهاد بکەن بۆ جەنگی عێراق،

فـارس کەبەمەیـان زانـی بڕیاریانـدا بـکەونە لەنـاوبردنی موسـەنا پـێش ئەوەی هێـزی پشـتیوانی پێبگـات، فارسـەکان بەسـەرکردایەتی کەسێکی نـوێ کەنـاوی "مهـران کـوڕی بـازان" بـوو لەگەڵ سـەد هەزار فـارس و پەنجـا هەزار پیـادە سـوپایەکیان پێکهێنـا بـۆ کۆتای هێنان بە موسەنا و کۆمەڵەکەی.

## جەنگی "البویب" : لە ڕەمەزانی ساڵی ١٣ هیجری

موسـەنا بەمەی زانـی کە فارسـەکان بەنیـازن هێرشـێکی سەرتاسـەری بـکەنە سـەریان، سـەربازگاکەی کە لە "حیرة" بـوو بڕیاریـدا کە بیگـوازێتەوە بـۆ نـاوچەیەکی تـر کەنـاوی "البویـب" بـوو دەکەوتە ڕۆژئـاوای فـوراتەوە، دەوروبەری نـاوچەکە بیابـانێکی پـان و گەورەبوو موسەنا ویستی ئەمجارە خۆی ناوچەی بەرەنگاری بونەوەی فارسـەکان دیاری بکـات بـۆیە ئەو شـوێنەی هەڵبژارد، وە بەپەلەش هەواڵی نـارد بـۆ هێزی پشـتیوانی کە گۆڕانکـاری کـراوە لە شـوێنەکەیان، کاتێـک کە هەواڵ گەیشـت بە هێـزی پشــتیوانی گۆڕانکاری لە ناوچەکە کراوە زۆر بەخێرای خۆیان ئامادەکرد و ژن و منداڵ و ئەو کەل و پەلانەی کە قورسـن بەجێیـان هێشـت و بەرەو نـاوچەی بەرەنگـاربوونەوە ڕۆیشـتن بـۆ

ئەوەی پـێش دەسـتپێکردنی جەنـگ بـگەنەئەوێ، وە سەرکەوتوشـبوون تیایـدا پـێش دەسـتپێکردنی جەنـگ گەیشـتنە نـاوچەکەو ژمـارەی سـوپای موسـەنا گەیشـتە دوانـزە هەزار (١٢٠٠٠)، سـوپای فـارس لە رۆژهەڵاتـی روبـارەکە وەسـتاو وەک جـاری پێشـوو سـەرکردەکەیان نـامەی نـارد بـۆ موسـەنا و نوسیتی:( یـان ئێـوە بپەڕنەوە بـۆ لامـان یـان ئێمە دەپەڕێینەوە بۆلاتان)، موسەنا نامەی نارد بۆی و وتی : (ئێوە بپەڕنەوە).

ئەم جەنگە لە رەمەزانی ساڵی ١٣ هیجریـدا رویـدا، موسـەنا فەرمانیکرد بە سـەربازەکان کە بەڕۆژووبن لەو رۆژەدا، جەنگ دەستیپێکرد و فارسـەکان کەوتنە مۆسـیقا لێدان و گـــۆرانی وتـــن هەتـــا موســـوڵمانان بترســـن و بێـــزاربن، بەڵام موســـوڵمانان دامەزراو خـــۆڕاگرانە وەســـتانەوە، موســـەنا هەمـــوو گرنگیەکـی ئەدا بە دڵـی ســـوپای فـــارس کە ســـــەرکردەکەیان بـــــوو، وە توانیشـــــی بەرەوڕوی بێـــــتەوەو بیکـــــوژێ، بە مردنـــــی سـەرکردەکەیان سـوپاکە شـڵەژاو ریـزی تێکچـوو، وە هەوڵی هەڵهاتنیـان ئەدا، موسـەنا پێشـتر گروپێکی دانـابوو بـۆ ئەوەی کە ئەگەر فارسـەکان نیـازی پاشـەکشـەیان هەبـوو رێیـــان لێبگیـــرێ لەکـــاتی دیـــاریکراودا، گـــروپەکە پردەکەیـــان پچڕانـــد و فارســـەکان رزگاربونیـــان مەحـــاڵ بـــوو، یـــان دەبـــوو شـــەڕیکەن یـــان هەڵبـــێن بەرەو بیابـــانە گەورەو پانەکە...

لەدوای جەنگکردن کە فارسـەکان تێکشـکان موسـەنا کۆڵی نەداو بەبەردەوامی هێرشی لەناکاوی دەکردە سـەر ناوچەکانی فارس لە باکوری عێراق، هەتا بزانن کە موسـوڵمانان بەردەوامـن لەجەنگکـردن، وە ترسـیش بخـنە دڵـی دوژمنـانەوە، فارسـەکان مەلیکێکی

نوێیان دانا بەناوی "یزدجرد" کە هەوڵی ڕێکخستنی سوپای فارسەکانی ئەدا لەناوخۆدا هەتا جارێکیتر خۆین ئامادەبکەنەوە بۆ هێرشکردنە سەر موسوڵمانان.

گۆڕانکاریە نوێکان کە رویان ئەدا دەگەیشتەوە بە خەلیفە عومەر و ئاگاداری هەموو بارودۆخەکان دەبوو، ئەویش فەرمانیکرد بە موسەنا کە پاشەکشەبکات لە عێراق و ئەوەندەی سەر سنورەکان بپارێزن بەسە، ئەمەش بۆ ئەوە بوو کە عومەر دەیویست سوپای موسوڵمانان ڕێکبخات و ئامادەیان بکات بۆ ئەو هێرشە گەورەیەی کە فارسەکان بەنیازبوون بیکەنە سەر موسوڵمانان...

عومەر نامەی نارد بۆ سەرکردەی عەشیرەتەکانی بیابانەکان و تیایدا نووسی: (هیچ کەسێکتان نەبێ کە بە چەک یان بە ئەسپ بەشداری نەکەن و هەرچی هەبوو بۆمان بنێرن و زۆریش بە پەلە بەدەم کارەکەوە بێن)

پاشان راوێژیکرد بە هاوەڵانی دەوری خۆی کە کێ سەرکردایەتی ئەم سوپایە بکات؟، هاوەڵان "سەعدی کوڕی ئەبی وەقاص" یان دیاریکرد و عومەریش رەزامەندی لەسەردا، هەڵبژاردنی سەعد بۆ ئەم کارە زۆر لەجێی خۆی بوو، چونکە سەعد یەکێک بوو لە دە موژدە پێدراوەکەی بەهەشت و وە هەروەها نازناوی شێری پێدرابوو، پێغەمبەر (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) دۆعای بۆ کردبوو کە هەموو تیرێکی جێی خۆی بگرێ و وە دۆعاشی گیرابێت، هەروەها یەکێکە لەو حەوت کەسەی سەرەتا کە هاتنە ئیسلامەوە، لەتەمەنی نۆزدە ساڵیدا موسوڵمان بووە، هەروەها خاڵی پێغەمبەرە (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ).

عـومەر سـەعدی ئامـادەکرد بـۆ سـەرکردایەتی ئەو سـوپایەو پێش ئەوەشی بەرێیبکات چەنـد ئامۆژگاریەکی بـۆکرد و پێی وت: (ئەی سـەعد بەوە لەخـۆت بـای نەبیـت کە پێـت دەڵێن خـاڵی پێغەمبەر (صَلَّى اللهُ عَلَيْـهِ وَسَلَّمَ)، چـونکە خـوای گەورە خـراپە بە خـراپە لەنـاو نابـات، بەڵکـو خـراپە بە چـاکە لەنـاو دەبـات، هەروەهـا خـوای گەورە جیـاوازی لەنێـوان خەڵکی ناکات بەهـۆی نەسـەبەوە بەڵکو بەهـۆی تەقـواوەیە، دەنـا لای خـوای گەورە ئەوەی خـانەدانەو ئەوەی خەڵکی ئاسـاییە یەکسـانن، بەڵکو ئەوەی لای خـوای گەورە بەرزت دەکاتەوەو پـلەت بڵنـد دەکات تەنهـا تەقـواو گـوێڕایەڵی فەرمـانی خـوایە، ئەمە بـاش لەگـوێ بگـرە، ئەگەر خەمسـاردبوی تیایـدا ئەوا دڵنیـابە لە زەرەرمەنـدان دەبی).

عومەر توانی بیست هەزار موسوڵمان کۆبکاتەوە بۆ ئەم جەنگە، بە سوپای موسەناوە ژمـارەی موسـوڵمانان گەیشـتە سـی و دوو هەزار کەس (٣٢٠٠٠) لەگەڵ ئەمەشـدا عـومەر سەرکردەکانی سوپای شامی ئاگادارکردەوە کە پێشتر لە عێراقەوە چوو بوون بۆ شام لەگەڵ خالید.

لەناو سوپاکەی سـەعدا نزیکی حەفتا هاوەڵای تێدابوو کە بەشـداری جەنگی بەدریـان کردبوو، پێچێت کەسێک بڵێت باشـە بـۆچی هاوەڵانی بەدر لەبەشـداری فتوحاتەکاندا کەم بوون؟

دەڵێـین: لەبەرئەوەی عـومەر ئەو هـاوەڵانەی کە لەوجۆرەبـوون لەدەوری خـۆی دەیهێشـتنەوە و رێی نەئەدا کە بڕۆن و مەدینە بەجێبهێڵن، چونکە راوێژی پێدەکردن و هەرکاتێک کارێکی گرنگ یان روداوێک رویبدایە ئەوا ئەهلی بەدری کۆدەکردەوەو راوێژی

پێدەکردن، بەتایبەت عەلی کوڕی ئەبو تالیب و عوسمانی کوڕی عەفان و زۆرێتر لەو هاوەڵانە، بەڵام لەم جەنگەدا کە عومەر بە جەنگێکی زۆر گرنگی دەزانی، رێگەیدا کە هاوەڵانی بەدر بەشداری بکەن، ئەمەش بۆ ئەوەنەبووە کە بڵێن بونی ئەوان بەرەکەت دەخاتە ئیشەکەوە بەڵکو بۆ ئەوەبووە کە موسوڵمانان زیاتر جێگیرو دامەزراوبن لەم جەنگە سەختەداو هەروەها ئەم هاوەڵانەش ببنە سەرکردەو نمونە بۆ خەڵکانی تر هەتا چاویان لێبکەن، چونکە هاوەڵانی بەدر نمونەی گیانفیدای و خۆڕاگری بوون لە جەنگەکاندا، هەروەها موسوڵمانان دڵیان بە هاتنی هاوەڵان خۆش بوو بەتایبەت کە دەیان وت سەرکەوتن بە دۆعاکانی ئێوە بەدی دێت.

**پلانی نویێ:-**

عومەر شوێنێکی دیاریکرد کە سەعد بیکاتە مەرکەزی سەربازی ئەویش قادیسیە بوو، هەڵبژاردنی ئەو شوێنە زۆر دەقیق و وردبوو، هەروەها تایبەتمەندی زۆر باشی هەبوو، عومەر فەرمانیپێکردن کە لەو شوێنە جێگیربن و مەیگۆڕن هەر شتێک روبدات هەتا دوژمن دەگات پێیان، عومەر پلانێکی نوێی دارشت بۆ سەعد بە راوێژکردنی هاوەڵان.

پلانی کۆن بریتیبوو لە دەستبەسەراگرتنی ناوچەی رۆژئاوای فورات لە لایەن موسوڵمانانەوە بۆ ئەوەی لەوێوە بگەنە ناوچەی حیرەو لەوێشەوە بگەنە مەدائین، بەڵام پلانە نوێکە جیاوازتربوو گۆڕانکاری تیاکراو ناوچەی قادیسیە هەڵبژێردرا، موسوڵمانان دەیانویست کە دوژمن بهێنە ئەو ناوچەیەوە بۆ جەنگکردن، ئەویش لەبەر ئەوەی کە ئەو ناوچەیە بیابانێک دەکەوتە پشتیەوە وە بیابانیش وەک دەڵێن " یاریگای عەرەبە" ، لەنێوان موسوڵمانان و دوژمنیشدا تۆڕێکی ئاڵۆز لە قامیش و زەلی

ئـاوی هەبـوو، دەبـوو دوژمـن بە ناچـاری بپەڕێـتەوە کە پەڕیشــەوە ئەوا لەدواوەی ئەو نـاوچە ئـاڵۆزە ئـاویە دەبێـت، ئەگەر موسـوڵمانان لە جەنگی قادیسـیەدا سـەرکەوتوبن ئەوا ڕێگای بەرەو مەدائـن بەدەسـت دەهێـنن، ڕێگەیەکی زۆر ئاسـان و خۆشیشـە هەتـا دەگاتە مەدائین چـونکە لەدوای قادیسـیە نـاوچەیەک دێـتە پێش کە دەکەوێـتە نێـوان هەردوو روبـاڕی دیجـلەو فـورات نـاونراو نـاوچەی "السـواد" نـاوچەیەکی پـربەرەکەت و کشتوکاڵیە.

سوپای سـەعد دەرچـون بە تەکبیرکردنەوە کە هەموو ئەوەی لەوناوچەیەبوون گوێیـان لە "الله اکبر" ی سوپاکەی سـەعد دەبوو، هەموو زۆر بە شـەوق و خۆشیەوە دەرچـون و دەیـانوت نـاگەڕێینەوە مەگەر زێـڕو زیـوی کیسـرا لەگەڵ خۆمـان نەهێنیـنەوەو تەختی پاشــایەتی نەروخێنــین، ئەم ســوپایە لە ١٣ شــەعبانی ســاڵی ١٤ هیجریــدا دەرچــوو، لەهەمـان کـات و ڕۆژدا موسـەنای کـوڕی حاریسـی شـەیبانی شـەهید بـوو بە هـۆی ئەو برینە سـەختەی لە جەنگی "الجسر" دا تووشی بوو بەداخەوە...

## قادسیە جەنگی یەکلاکەرەوە

لە مێژووی ئیسلامیدا لەدوای وەفاتی پێغەمبەر (صَلَّى اللَّه عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) هیچ جەنگێک وەک جەنگی قادسیە کاریگەر و دەنگۆی نەداوەتەوە، چونکە ئەو جەنگە یەکلاکەرەوەی نێوان موسوڵمانان و فارسەکان بوو، وە مێژوونوسانیش زۆر بە گرنگی و بە وردی باسی ئەم جەنگەیان گێڕاوەتەوە...

تەبەری دەڵێت: (هەموو عەرەب لە جەزیرەی عەرەبی زۆر بە تامەزرۆیەوە چاودێری هەواڵی ئەم جەنگەیان دەکرد هەتا بزانن کۆتای ئەم جەنگەی بەچی دەگات، هەتا پیاوێک بیویستایە کارێک ئەنجامبدات ئەوا دەیوت هیچ ناکەم هەتا ئەنجامی ئەم جەنگە دەبینم چونکە هەموو دانیشتوانی ناوچەکە ئەم جەنگە لەلایەن یەکلاکەرەوەی بارودۆخەکان بوو)

جەنگی رۆم کە لەشام رویدا بە پێچەوانەی قادسیەوە مێژوو نوسان بە یەکلاکەرەوە ناویان نەبردووە، هۆکاری ئەمەش بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە لەبەرئەوەی جەنگی رۆم لە شامدا وەک پایتەختی رۆم دانەنراوە، بەڵکو پایتەختی رۆم ئەوکات لە قوستەنتینیە بوو کە لەدوای شەش سەدە لەسەر دەستی "محمد فاتح" پایتەختی رۆمیش ئازادکرا.

سەعد لە قادسیە بۆ ماوەی مانگێک مایەوەو هیچ جۆرە جەنگێک لەنێوان موسوڵمانان و فارسدا روی نەدا، نامەیەکی نارد بۆ عومەرو تیایدا نووسی: (هەتا ئێستا هیچ جەنگێک روینەداوە و هیچ کەسێک لە نوێنەری ئەوان نەهاتوون بۆ لامان بۆ ئاگاداریتان بزانن).مانەوەی سەعد و سوپاکەی لە قادسیە درێژەی کێشا هەتا بووە ساڵێک! بەڵام عومەر لەو ماوەیەدا بەردەوام چاودێری سەعد و سوپاکەی دەکردو

بەبەردەوامی نـامەی دەنـارد بۆیـان و ئامۆژگـاری دەکـردن لەو ئامۆژگاریـانەش ئەمـانە بوون:

((پەیمان لەگەڵ دڵت ببەستە، ئامۆژگاری سـەربازەکانت بکە بە پاکردنەوەی نیەتیـان بـۆ خـوای گەورە، هەرکەس ئەم مەبەسـتەی پشـتگوێ خسـت زوو بیـری بهێـنەوە، ئـارامگرین چـونکە ئـارامگری دەبێـتە هـۆی ئەوەی کە خـوای گەورە هاوکارتـان بێـت، وە نیەتـان پـاک بکەن چـونکە خـوای گەورە پاداشـتان لەسـەر نیەتـان ئەداتەوە، ئاگادارین لەسـەر ئەو کـارەی لەسـەرین و وە لەسـەر ئەو رێگـایەی هەڵتـان بـژاردووە، وە داوای لێخۆشـبوون بـکەن لە خـوای گەورە، بەردەوام دەمتـان بە زیکـری خـوای گەورە پـاراو بـکەن و ئەم زیکـرە بڵێـنەوە "لا حـول ولا قـوة إلا بـالله))، بـۆم بنوسـە زۆر بە وردی کە لەچی شـوێنێک سـەربازەکانت کـۆکردۆتەوە، وە بەتـایبەت ئەو شـوێنەی کە دەگەن بە فارسـەکان، لەو نـامەیەی بـۆم دەنێری هەمـوو ئەو زانیاریـانەی تیابنووسـە کە دوژمـن دەیەوێ لەکوێـوە هێـرش بەرێـت و وە لەکـوێ جێگیربـووە، هەواڵـی جـێگەو رێـگەی موسـوڵمانانم بـۆ باسبکە، وە ئەو شـارەی دەکەوێتە نێـوان ئێـوەو ئەوانەوە، وا هەواڵـم بـدەرێ وەک ئەوەی خـۆم لەوێبم، هەتا منیش فەرمانێکتـان پێبکەم کە سـودی هەبێت بۆتـان، لەخـوای گەورە بترسـن و بگەرێـنەوە بـۆ لای ئەو، وە بشـزانن کە خـوای گەورە بەڵێنی خـۆی دەباتەسـەر، وە تەوەکولتـان لەسـەر ئەوبێـت پێویسـتان بە هیچترنابێـت، رەوشـت و ئاکارتان باجوان بێت هەتا بەرامبەرتان دڵی بگۆڕێ و کاریگەربێت پێتان.

**وەسیەت و ئامۆژگاریەکیتر کە فەرمویەتی بۆیان:**

فەرمان دەکەم بە خۆت و ئەو سەربازانەی لەگەڵتان بە تەقواکاری لەهەموو کات و ساتێکدا، ترسان لە خوای گەورە باشترین ئامادەکاریە بۆ جەنگکردن و جیهاد، وە هەروەها فەرمان دەکەم بە خۆت و بەوەی کە لەگەڵتایە پێداگربن لەسەر گوناح نەکردن، چونکە گوناحکردن و تاوان دەبێتە هۆی ئەوەی کە سوپاکەتان ترسی لەدڵدا بڕوێت بەرامبەر دوژمن، وە دڵنیابن کە موسوڵمانان سەردەکەون بە هۆکاری گوناح و تاوانی دوژمنان، ئێمە بەرامبەر ئەوان بێهێزترین چونکە ژمارەی ئەوان زیاترە لە ئێمە هەروەها توانای سەربازیشیان زیاترە لە ئێمە، ئەوەی کە لەوان بەهێزترمان دەکات تەقواکاری ئێمەیە جا ئەگەر ئێوەش وەک ئەوان گوناح و تاوان بکەن ئەوا بە دڵنیایەوە ئەوان سەردەکەون.

**رۆستەم بەکۆڵێکی قورسەوە هات بۆ بەرەنگاربونەوەی موسوڵمانان:-**

بەشێک لە وڵاتی فارس لەژێر حوکمڕانی گەنجێکدابوو بەناوی "یزدجرد" کە کەسێکی کەم ئەزموون و خۆبەزلزان بوو، تەمەنی لە بیست ساڵ زیاتر نەدەبوو، فەرمانیکرد بە سەرکردەی سەربازی فارس کە ناوی "رۆستەم" بوو، کەسێکی خاوەن ئەزموون بە تەمەن بوو، داوای لە رۆستەمکرد کە خۆی ئامادەبکات و کۆتای بە موسوڵمانان بهێنێ لە ماوەیەکی کەمدا...

رۆستەم هەواڵی موسوڵمانانی دەزانی و زانیاری لەسەر سوپای موسوڵمانان هەبوو دەشیزانی کە شکست پێهێنانیان کارێکی ئاوا ئاسان نیە کە "یزدجرد" چاوەڕێیدەکات، بەڵکو رۆستەم بەلایەوە زۆر قورس بوو بەتایبەت لەکات و ساتێکی ئاوادا کە مێژی

موسـولْمانان زۆربـوون، رۆسـتەم داواکەی مەلیکی دواخسـت بە ئومێـدی ئەوەی کە دەرفەتێکـی بـاش بێـتە پێشـەوە ئەوکـات هێرشـبکات، بەڵام بێسـودبوو چـونکە موسـولْمانان پێشـتر هـاتبونە نـاوچەی قادسـیەو لەوێ جێگیربووبـوون، هەروەهـا موسـولْمانان بەردەوام لەو ناوچـانەی عێراق سـیریەی بچوکیـان دەردەکـرد و هێرشـی لەناکاویـان ئەنجـام ئەدا بـۆ ئەوەی ورەی موسـولْمانان بەرزبێـتەوەو هەروەهـا هێـزی دوژمنـیش شـەوکەتی بشـکێ، هەروەهـا فارسـەکانیان والێـدەکرد بەم کارانە بـۆ ئەوەی بێنە نـاو جەنـگەکەوە، پاشـان موسـولْمان رێگای بازرگانی و کشـتوکاڵی ناوچەکانی ژێر دەسـتی فارسـیان کـۆنترۆڵ دەکـرد بەمەش دەسـەڵاتی "یزدجـرد" کەوتبـووە ژێـر پرسـیارەوەو هەسـتی بە شـکاندنی شـەوکەتی دەسـەڵاتی خۆیـدەکرد، بـۆیە بـۆ جـاری دووەم "یزدجـرد" داوای لە رۆسـتەمکرد کە پەلەبکـات لە هێرشـکردن بـۆ سـەر موسـولْمانان و کۆتـای بەم بـارودۆخە بهێنێـت، کاتێک رۆسـتەم هـیچ بیـانویەکی نەما بـۆ دواخستنی جەنگەکە کەوتە کۆکردنەوەی سەرباز بۆ خۆئامادەکردن بۆ جەنگ، سەدو بیست هەزار کەسی کۆکردەوە کە نیوەی ئەسپ سواربوون و ئەوانیتریش بریتیبوون لە بەردەست و خزمەتکاریان و لەگەڵ کۆمەڵێک فیل، رۆسـتەم بەرێکەوت لە پایتەختەوە کە مەدائـین بـوو بـۆ قادسـیە بەڵام بە کـۆڵێکی قورسـەوە، ژمـارەیەکی زۆر لە کەل و پەلیان لەگەڵ خۆیان هێنابوو بە بیانوی ئەوەی کە رێگاکە دوورە لەکاتێکدا ئەو رێگایە لە سـەد و شەسـت کیلـۆمەتر زیـاتر نەبـوو بەڵام بەمـاوەی چوارمانـگ ئەو رێگایەیـان بڕی!!.

**وەفدی یەکەمی موسوڵمانان بۆ لای ڕۆستەم:**

ڕۆستەم داوایکرد کە موفاوەزەبکات لەگەڵ موسوڵمانان، سەعد وەڵامی دایەوەو "روبعی کوڕی عامری"نارد بەتەنها بۆ موفاوەزەکردن لەگەڵ ڕۆستەم، ڕۆستەم فەرمانیکرد کە شوێنێک دابنێن بۆ پێشوازیکردن لە وەفدی موسوڵمانان کە بەجوانترین شێوە بڕازێندرێتەوە هەتا گەورەی و شەوکەتی فارسی تیادەربکەوێت، وە ڕۆستم خۆی جلێکی شاهانەی لەبەرکرد، هەتا پیشانی وەفدی موسوڵمانان بدات و کاریگەری بکات لەسەریان، بەڵام کاتێک روبعی کوڕی عامر هات هەموویان توشی شۆک بوون، چونکە روبع کە چووە ژورەوە رمەکەی بەدەستەوە گرتبوو بەدوای خۆیدا رایدەکێشا، بەمەش ئەو فەرش و زینەتانەی دانرابوون لە نوکی رمەکە دەخشێنرا، کاتێک گەیشتە لای ڕۆستەم لەسەر زەویەکە دانیشت و رمەکەی خستە سەر فەرشەکان، ڕۆستەم پێی وت: ئەرێ بۆ لەوێدا دانیشتوی؟

روبعی وتی: نامەوێ لەسەر ئەو شتانە دانیشم حەزم پێینیە، ڕۆستەم وتی: بۆچی هاتوون بۆ ئێرە؟

روبعی وتی: خوای گەورە ئێمەی ناردووە کە خەڵکی لە بەندایەتی بەندەوە دەربهێنین بۆ بەندایەتی خوای گەورە، وە سەختی و ناڕەحەتی دونیا بگۆڕین بۆ خۆشی و فراوانی دونیای و ئاخیرەت، لە زوڵمی دینەکانەوە بۆ دادپەروەری ئیسلام، ئێمە هاتووین هەتا بانگتان بکەین بۆ ئەم ڕەوشتەجوانانە، ئەگەر ئێوە قبوڵتانکرد لێمان ئەوا ئێمەش دەگەڕێینەوە بۆ ناوچەکانی خۆمان و ئێوەش خاوەنی ناوچەو وڵاتی خۆتان دەبن، بەڵام ئەگەر ئێوە پشتانکرد لەم بانگەوازە ئەوا جەنگتان بەرامبەر رادەگەیەنین هەتا خوای

گەورە وەعدی خۆی دێنێتە جێ، رۆستەم وتی: وەعدی خوا چیە؟ روبعی وتی: وەعدی خوای گەورە بەهەشتە بۆمان ئەگەر جەنگمان کرد لەگەڵتان و کوژراین، هەروەها سەرکەوتنە بەسەرتانە ئەگەر نەمردین و ماین لەژیاندا، رۆستەم وتی: گوێم لە قسەکانت بوو ئایە دەکرێ ئەم جەنگ دوابخەین هەتا پرسێک بە دەوروپشتی خۆم و سەرو خۆم دەکەم؟ روبعی وتی: بەڵێ دەکرێ، چەند رۆژ پێت خۆشە، رۆژێک یان دوو ڕۆژ باشە؟ رۆستەم وتی: نا، بەڵکو هەتا ئەوکاتەی نامە دەنێرم بۆ کەسانی سەروخۆم و راوێژیان پێدەکەم، روبعی وتی، ئێمە لەسەر رێبازو رێگای پێغەمبەرەکەمان دەبین و وە کاریش بەوەدەکەین، ئێمە روبەڕوبونەوەی دوژمن دواناخەین هەتا سێ رۆژ، ئێستا سەیری پێشنیاری ئێمە بکەو خۆشت بڕیار بدە لەم سێ خاڵە یەکیان هەڵبژێرە:

یەکەم: ئیسلام هەڵبژێرن دەگەڕێینەوەو زەوی و خاکی خۆتان بۆ خۆتان.

دووەم: ئەگەر موسوڵمان نابن ئەوا جزیەتان لێوەردەگرین، بەڵام ئەگەر سەرکەوتین بەسەرتاندا ئەوا ماڵ و سامانتان دەبنە غەنیمەت.

سێیەم: یان لە رۆژی چوارەمدا جەنگتان لەگەڵ ئەنجام ئەدەین.

وە لە رۆژی چوارەمدا ئێمە دەستناکەین بەجەنگ کردن هەتا ئێوە دەستی پێنەکەن، وە من دەبمە کەفیلی هاوەڵان و سەربازانی خۆمان کە پابەند دەبن بەم خاڵانەوە.

رۆستەم وتی: ئایە تۆ گەورەی ئەوانیت؟ روبعی وتی: نەخێر، بەڵام موسوڵمانان هەموویان وەک یەک لاشەوان هەندێکیان لەبەر پێویستی لەسەرو هەندێکی ترەوە دادەنێرن.

رۆستەم رویکردە راوێژکارو سەرکردەکانی دەوری وتی: چی دەڵێن؟ ئایە گوێبیستی قسەی ئەم پیاوە بوون؟ قسەکانی لاتان ڕوونە؟ قسەی لەمە باشترتان لایە؟ وتیان: پەنا ئەگرین بەخوا دەتەوێ واز لە دینی خۆمان بهێنین بۆ ئەم "سەگە" ئەرێ نابینی چی لەبەردایە؟

رۆستەم وتی: حوکم مەدەن لەسەر جل و بەرگەکانی بەڵکو سەیری قسەو گوفتاری بکەن، عەرەب گرنگی نادەن بە جل و بەرگ و خواردن.

رۆستەم نەیتوانی قەناعەت بە خەڵکەکەی دەوروبەریبکات بۆ ئەو بیرۆکەیەی هەیبوو، کە بەرەنگاربوونەوەی موسوڵمانان لە ئێستادا کارێکی هەڵەیە...

رۆستەم داوایکرد کە وەفدێکیتر بنێرن موسوڵمانان بۆ موفاوەزەکردن، سەعد ئەمجارە "حوزەیفەی کوڕی موحصەن"ی نارد کە ئەویش وەک روبعی کوڕی عامر بوو، هەمان وەڵامی رۆستەمی دایەوە، پاشان بۆ جاری سێیەم رۆستەم داوایکرد کە وەفدێکیتر بنێرن بۆ موفاوەزەکردن، سەعد ئەمجارە "موغەیرەی کوڕی شوعبەی" نارد بۆ لای رۆستەم، کە یەکێک بوو لە پیاوە زیرەک و لێهاتووەکانی عەرەب وە هەروەها کەسێکی زۆر بەهەیبەت و خاوەن لاشەیەکی گەورە و زمانێکی پاراوبوو، کاتێک چووە ناو خێمەکەی رۆستەمەوە رۆیشت نەوەستا هەتا گەیشتە شوێن دانیشتنی رۆستەم و لەسەر جێگا شاهانەی ئەو لەتەنیشت رۆستەمەوە دانیشت، فارسەکان کەوتنە بۆڵەبۆڵ کردن و قسەکردن کە چۆن دەبێ بچێتە ئەو شوێنە...

موغەیرە وتی: بۆڵە بۆڵ مەکەن، ئێمە پێشتر ئاواتمان دەخواست بە ئێوە، بەڵام ئێستا من لێرە ئەوە نابینم، عەرەب ئێستا جیاوازی ناکات لەنێوان کەسەکاندا، هیچ

بەنــدەیەک پــێش بەنــدەیەکیتر ناکــات، مەگەر ئەوەی کە دژایەتــی یەکتــری بــکەن، باشترین کار ئێستا ئەوەیە کە هەموو خەڵکەکە وەک یەکبن، ئەمەش کارێکی راستە کە بیکەن، مـن کەهـاتوم بـۆ ئێرە ئێـوە بانگهێشـتانکردوم، ئەگەر ئێـوە ئـاوا هەڵسـوکەوت بکەن ئەوا بچوک دەبنەوە، وە نەمدیوە کە مەلیک ئاوا بیربکاتەوە.

خەڵکی ناو مەجلیسەکە وتیان: کابرای عەرەب راستی وت.

وە پیاوماقوڵانی نـاو دانیشـتنەکەش وتیـان: سـوێندبەخوا قسـەیەکی تێگـرتین هەرچی بەندەو کۆیلە هەیە لێمان دەبنەوە.

ئەم موفــاوەزەیە کۆتــا هەوڵــی رۆســتەم بــوو بــۆ دواخســتنی جەنــگ، بەڵام ئیتــر فێڵکردنەکەی لەوە زیاتری نەخایەند، ئیتر کاتی ئەوەهات کە روبەڕوبونەوەی سەربازی دەستپێبکات.

ســەعدی کــوڕی ئەبــی وەقــاس توشــی نەخۆشــیەک بــوو کە نەیــدەتوانی راســتەوخۆ بەشـداری جەنگەکە بکات، بەڵام بـۆ ئەوەی لە دوورەوە چـاودێری جەنـگ بکـات چـووە سـەر قەڵایەک و چـاودێری دەکـرد، وە لەجێی خـۆی خالیـدی کـوڕی عەرفەتەی کـردە جێگیری مەیدانی لە جەنگەکەدا.

## ڕۆژەکانی قادسیە

### ڕۆژی یەکەم: ڕۆژی "أرماث" ١٣ شەعبان ساڵی ١٥ هیجری

ڕۆستەم نامەی نارد بۆ موسوڵمانان وەک پیشەی هەموو جارێکیان و وتی یان ئێوە بپەڕێنەوە بۆ لامان یان ئێمە دەپەڕێینەوە بۆ لاتان، وەڵامیان دانەوەو وتیان: ئێوە بپەڕێنەوە بۆ لامان.

سەعد فەرمانیکرد بە سەربازەکانی و ووتی: ((لەشوێن خۆتان جێگیربن، مەجوڵێن هەتا نوێژی نیوەڕۆدەکەن، کاتێک نوێژی نیوەڕۆتانکرد ئەوا بە تەکبیرکردنێک ئاگادارتان دەکەینەوە، کاتێک گوێ بیستی تەکبیربوون شمەکەکانتان لەبەر بکەن و لە ئامادەباشیدابن، وە بشزانن کەستان تەکبیر نەکات لە خۆوە چونکە تەکبیرکردنەکە بۆ ئەوەیە کە حازرتان بکات، کاتێک گوێبیستی تەکبیری دووەم بوون، ئەوا هەستن و ریزەکانتان رێکبخەن، کاتێک تەکبیری سێیەم کرا ئەوکات بکەونە جوڵەو ئەسپەکانتان حازربکەن و سواری ببن، کە تەکبیری چوارەم کرا ئیتر بەرێبکەون بۆ ناو هێزی دوژمن و بڵێن ((لا حول ولا قوة إلا بالله)).

تەکبیرات دەستی پێکردوو کەوتنە جوڵە، کە گەیشتە تەکبیری سێیەم غالبی کوڕی عبدالله ئەسەدی دەرچووە دەرێ و داوای زۆرانبازی کرد، هورمز کە یەکێک بوو لە سەرکردەکانی فارس ئەویش دەرچووە دەرێ و کەوتنە جەنگکردن، غالب نەیهێشت دەستبکاتەوەو خێرا گەیشتە سەری و بە ئەسیری هێنایەوە ناو ریزی موسوڵمانان.

موسوڵمانان چاوەڕێی گوێبیستی تەکبیری چوارەم بوون، بەڵام فارسەکان هێرشیان کردە سەر دڵی سوپای موسوڵمانان کە قەبیلەی "بجیلة" لەوێ بوون بەهێزترین بەشی

سـوپای موسـوڵمانان بـوون، وە هەردوو قەبیلەی "کنـدة و ماتـان" کە یەکیـان گرتبـوو نزیکـی چارەکێـک لە سـوپای موسـوڵمانانیان پێکهێنـابوو کە (٨٠٠٠) کەس دەبـوون هێرشێکی زۆر بەهێزیان کردە سەر فارسەکان، وە فیلەکان دەورێکی گەورەیان دەبینی لە ترسـاندنی ئەسـپەکان، بـۆیە موسـوڵمانان دادەبەزیـنە سـەر زەوی و لەسـەر پێکانیـان دەسـتیانکرد بە جەنگکـردن، لەوکاتەدا سـەعد فەرمانیکرد کە شـوێنی قەبیلە ئەسـەد بگۆڕدرێ بـۆ نـاوچەی قەبیلەی بجیلـة هەتـا پشـتیوانیان بکات کە ژمارەیـان سێ هەزار کەس دەبوو، بەنـو ئەسـەد چـونە هاوکاری براکانیـان دەورێکی زۆر بـاش و پاڵەوانەیـان بینی لە هاوکاری کردنـی براکانیـان، هەتـا گەیشـتە ئەوەی کە لە ڕۆژی "أرمـاث" دا بەنـی ئەسەد پێنج سەد شەهیدیاندا.

سـوپای موسـوڵمانان کەمـابون دەسـتبەجەنگ بـکەن نەکەوتـنە جـوڵە هەتـا سـەعد تەکبیـری چـوارەمی لێـدا، ئیتـر سـوپای موسـوڵمان دەرچـوون بـۆ نـاو جەنـگەکە بـۆ هاوکاری براکانیان، کۆمەڵێک لە موسوڵمانان توانیان بگەنە لای فیلەکان و کۆڵە پشتی فیلەکان بپچڕێنن و کابرای سەر فیلەکان بەردبدەنەوەو بیکوژن.

ڕۆژی یەکەم لە ڕۆژەکانی جەنگی قادسیە کۆتای پێهات لە نێوان هەردوولادا.

وەسیەتی خەنسا بۆ کوڕەکانی لە شەوی دوای جەنگی أرماث:

خەنسـا هەر چـوار کـوڕەکەی کـۆکردەوە و ئامۆژگـاری کـردن و وتـی: (ئێـوە موسـوڵمان بـوون بە ویسـتی خۆتـان وە جیهادتـان هەڵبژاردووە بە ئیرادەی خۆتـان، وە ئەوەش بـاش دەزانــن کە خــوای گەورە چـی پاداشــتێکتان ئەداتەوە لە بەرامــبەر جەنگکــردن دژی کافران، وە دەشزانن کە ئاخیرەت باشترە لە دونیا، سبەی کە بەیانی بۆوە "ان شـاء الله"

بە سـەلامەتی، بچـن بـۆ جەنگکـردن دژی دوژمنانتـان، خـوای گەورە و مسـوڵمانان سـەربخەن، کاتێـک جەنـگ دەسـتیپێکرد زۆر بە خێـرای و هێـزەوە بچنەنـاوی، ئەو شوێنەیان لێبکەن بە ئاگر، ئاگر لە خێمەو شوێنی نیشتەجێ بونیان بەربدەن، بگەنە سەرکردەو ئەمیریان لەناویان بەرن، دوربکەونەوە لە غەنیمەت و ناوبانگ باهەوڵتان بۆ قیامەت و رەزامەندی خوابێت)

بەڕاستی جێی سەرسوڕمانە بۆ وەها ئیمانێک کە لەدڵی ئەم ژنەدا دروستبووە، ئەم خەنسایە لە سەردەمی جاهیلیدا برایەکی لەدەست ئەدا کەناوی "صخر" دەبێت، بۆ مردنی براکەی لاوانەوەیەک بە شیعر دەردەبڕێت کە هێندە کاریگەر دەبێت هەموو شاعیرانی سەردەمی خۆی لەبەری دەکەن، بەڵام لەدوای ئەوەی دێتە ناو ئیسلام بانگی هەرچوار کوڕەکەی دەکات کە بێن لە پێناوی خوای گەورە روحی خۆیان ببەخشن...

**رۆژی دووەم: رۆژی "أغواث" گەیشتنی هێزی پشتیوان لە شامەوە:**

هاوکاری هێـزی پشـتیوانی لە شـامەوە کە هـاتبوون نزیـک ببـونەوە کە بـگەنە نـاو جەنگەکە، سەرەتای ئەم هێزی پشتیوانیەش کەهات قەعقەعی کوڕی عەمرو لەگەڵ هەزار ئەسپ سوار گەیشتنە مەیدانی جەنگ لەگەڵ دەرکەوتنی خۆر لە رۆژی أغواث.

قەعقەع لەو رۆژەدا هات فێڵێکی زۆر زیرەکانەی دانا بۆ سوپاکەی هەتا ترس بخاتە دڵی دوژمنانەوە، ئەو هەزار کەسەی لەگەڵی بوون هات دابەشیکرد بەسەر سەد کۆمەڵدا هەر کۆمەڵەی دە ئەسپ سواری تێدابوو، فەرمانیکرد بەهەر کۆمەڵێک کاتێک دەگەنە سەربازگای موسـوڵمانان کەنزیـک بـونەوە بەقەد ئەوەی چـاو دەیبینێ ئەوا بچـنە نـاو هێزی موسوڵمانان، پاش ئەوەی کە هێزی یەکەم چوو بەدوایدا هێزی دووەم بێت، ئا

بەو شـێوەیە بەردەوام بـن هەتـا هەمـوو هێزەکە داخـڵ دەبـنە نـاو موسـوڵمانان بەم شـێوەیەش تەپ و تـۆزێکی زۆر لەو نـاوچەیە بڵاودەبێـتەوە و بەرزدەبێـتەوە، هەتـا وای لێـدێت کاتێـک خـۆر ئەیـدات لەو شـوێنە وا دەردەکەوێـت کە ژمـارەیەکی زۆر سـوپای پشتیوانی گەیشتووە.

کاتێـک دەسـتیپێکرد جەنـگ قەعـقەع چـووە دەرەوە و داوایکـرد کە کەسـێک بێـت لەگەڵیدا زۆران بکات، لە فارسەکان بەهمەن جازەویە کە سەرکردەی جەنگی الجسر بوو پێشتر ئەو هاتە دەر بۆ زۆرانکردن، بەهمەن پێشتر قەعقەعی نە ناسیبوو بۆیە لێی پرسی تـۆ کێیـت؟ کاتێـک ویسـتی خـۆی بناسـێنێ قەعـقەع هـاواریکرد (ئەی کـوڕی بەنـدە مردنـت نـزیکە) ئیتر قەعـقەع تـوانی بەهمەن بکوژێ بەمەش سەرەتایەکی زۆر بـاش بـوو بۆ موسوڵمانان ورەیەکی زۆری پێدان، لە راستیدا سوپای موسوڵمانان لەم رۆژەدا سێ تایبەتمەندی هەبوو:

یەکەم: بـونی قەعـقەع لەو جەنگەدا کە عـومەری کـوڕی خەتـاب دەربـارەی دەفەرمـوێ :(سوپایەک قەعقەعی تێدابێت شکست ناهێنێ) هەروەها دەڵێت : (سەوتی قەعقەع لە جەنگدا بەرامبەر هەزار کەسە).

دووەم: لەناوبردنی هێزی فیلەکانی لە رۆژی یەکەمدا بە پچڕانی کۆڵەپشتی سەرفیلەکان و کوشـتنی سـەربازی سـەرفیلەکە و وە بەکارهێنـانی ئەسـپەکان کە پێشـتر لەترسـی فیلەکان نەیان دەتوانی بێنە ناو جەنگەکەوە.

سـێیەم: فیلیـک کە قەعـقەع کـردی ئەویـش بە بەسـتنی دەم و چـاوی حوشـترەکەی، قەعقەع لەگەڵ ئامۆزاکەی هاتن قیناعێکیان دا لە دەم و چاوی حوشترەکانیان مەتا شێوەیەکی ترسناکی هەبێت، تەبەری دەڵێ:

((بەم کارەی کە قەعقەع و ئامۆزاکەی کردیان لە حوشترەکانیان ئەسپی فارسەکان کە ئەمەیـان دەبیـنی لەجـێی خۆیـان نەدەوەسـتان هەر بەمـلاو لادا رایانـدەکرد، کاتێـک موسـوڵمانان ئەم دیمەنەیـان بینی ئەوانـیش هـاتن بەهەمـان شـێوەیان کـرد، ئەسـپی فارســەکان کاتێـک ئەم حوشــترە دەم و چــاو بەســتراوانەیان دەبینی لەو کـاتەی کە لەجەنگی أرمـاث دا موسـوڵمانان چیـان لێهـات لەکـاتی بینینی فیلەکـان ئەمـان لەوە خراپتریان لێهات بە بینینی ئەم حوشترانە لەجەنگی أغواث)

فارسەکان لەم رۆژەدا توشی شکست هاتن کە بووە هۆی مردنی دەهەزار کەس لێیان، موسـوڵمانانیش دوو هەزار کەسـیان لێ شـەهید بـوو، لەناویانـدا هەر چـوار کـوڕەکەی خەنسـاش، کاتێـک هەواڵ گەیەنـرایەوە بە خەنسـا وتی: (سـوپاس بـۆ خـوای گەورە کە شـەرەفی ئەوەی پێبەخشیم، وە داوادەکەم لە خـوای گەورە کە بیانخـاتە ژێر رەحمەت و بەزەیی خۆیەوە).

**رۆژی سێیەم: رۆژی عماس:**

لەدوای گەیشتنی هێزی پشـتیوانی کە لەگەڵ قەعـقەع هاتبوون هیچ هێزێکیتر نەهات، ئەو شــــەوە قەعــــقەع نەخەوت کەوتە بیرکــــردنەوە بــــۆ دانــــانی فێڵێــــک، لەگەڵ سەرکردایەتی سوپاکە کۆبۆوە رێکەوتن لەسەر ئەوەی کە بۆ ئەوەی ورەی موسوڵمانان بەرزبـکەنەوەو وە ترسـیش بـخەنە دڵی دوژمنـانەوە هـاتن ئەم بیرۆکەیـان داڕشـت، لە

تـاریکی شـەودا قەعـقەع فەرمـانیکرد کە هەزار ئەسـپ سـوار بەنهێنی بچـنە دەرەوەی سـنوری جەنـگەکە بـۆ ئەوەی کە هـاتن وابـزانن کە هێـزی پشـتیوانی هـاتووە و وە فەرمانیشی کـرد کە کەس ئەم بیرۆکەیە نەزانێ، سـوپاکەی کـرد بە دە بەشـەوە، هەر بەشـەی سـەد ئەسـپ سـواری دانـا، لەگەڵ هەڵهـاتنی خـۆردا فەرمـانیکرد بەش بەش داخڵـی سـنوری جەنگەکەبـن، لەگەڵ بەیـانی بـۆوە وەک ڕێکەوتبـون لەسـەری کە بیرۆکەکە جێبەجێبکرێـت، بەڵام ئەوەی چـاوەڕوانەکرا ئەوە بـوو کە هێزی پشـتیوانی لەشەماوە بە سەرکردایەتی "هاشم کوڕی عوتبەی کوڕی ئەبی وەقـاص" گەیشـت، ئیتر هاشـم لەم بیرۆکەیەی کەدانرابـوو تێگەیەنـرا، هەردوو سـوپاکە وەک بەرنـامەی بـۆ دانرابـوو کەوتـنە جێبەجێکردنـی، بەمەش کـاریگەریەکی زۆر گەورەیـان دروسـتکرد بە خستنە ترس لە دڵی فارسەکان...

لەو ڕۆژەدا کە جەنـگ دەسـتپێکرد فارسـەکان جـارێکیتر فیلەکانیـان هێنـایەوە نـاو گۆڕەپانی جەنگ، بەڵام ئەمجارەیان فارسـەکان بەدەوری فیلەکاندا سـەربازیان دانابوو بۆ پاراستنی فیلەکان، کاتێک سـەعد ئەمەی بینی کەوتە بیرکردنەوە بۆ ئەوەی مەترسی فیلەکـان کە پێشـتر کـاریگەری هەبـوو لەسـەر سـەربازو ئەسـپەکان ئەمجـارە بەشـێوەیەکیتر کۆتاییـان پێبهێنێـت، پرسـیاریکرد لە خەڵـکەکە کە ئـایە چی ڕێگـایەک باشـە بـۆ ئەوەی فیلەکان برینـدار بکەیـن و دوربکەونەوە لە گۆڕەپـانەکە؟، وتیـان بەڵێ ڕێگایەک هەیە ئەویش برینداركردنی چاوی فیلەکانە بەوە نەبێت فیلەکان لەناو ناچن، سـەعد نـاردی بەشـوێن قەعـقەع و بـراکەی کە عـاصـم ی نـاوبوو، کە کۆتـای بهێـنن بە فـیلە سـپیەکە کە سـەرکردەی فیلەکان بـوو، وە نـاردی بەشـوێن حمـال کوڕی مالـک کە

سەرکردەی پیادەکان بوو وە ڕەبیلی کوڕی عەمر کە کۆتای بهێنن بە فیلەکەی تریان کە ئەویش سەرکردەیەکی تری فیلەکان بوو.

هەردوو کۆمەڵەکە سەرکەوتووبوون لە برینداركردنی چاوی فیلەکان، وە پچڕانی کۆڵەپشتی فیلەکان، بەمەش هەدوو فیلەکە رایانکردو دورکەوتنەوە لە جەنگەکە کە ئەم دوو فیلە ڕاهێنراوبوون لەسەر ئەم جۆرە کارانە، دواتر فیلەکانی تریش کەوتنە دوای ئەو دووفیلەی ترو دورکەوتنەوە لە گۆڕەپانەکە.

جەنگ بەردەوام بوو لە ڕۆژی عماس ڕۆژ و شەوێک واتە بیست و چوار کاتژمێر بەبێ وەستان.

## ڕۆژی چوارەم: ڕۆژی قادسیە ١٦ شەعبان ساڵی ١٥ کۆچی

زۆر گرنگە کە سەرکردەی سوپا لەکاتی جەنگدا بچێتە مەیدان و بەشداری کردای هەبێت، بەتایبەت لە ڕۆژی چوارەمدا فارس لە بەهێزیەوە بەرەو لاوازی دەچوو، قەعقەع هات بۆ بەرزکردنەوەی ورەی موسوڵمانان کەوتە دانانی پلانێک بۆ کوشتنی ڕۆستەم، وە سەرکەوتوش بوو لە کارەکەی، بە مردنی ڕۆستەم ورەی فارس بەتەواوەتی روخا، تەبەری ئەم روداوە باس دەکات و دەڵێ:

((پیاوێک لە بەنی عبس وتی: لە جەنگی قادسیەدا فارسەکان خراپ لێیان دەکوژرا لەدوای ئەوەی کە خەڵکەکەی ورەیان تەواو دابەزیبوو، دەکوژران بە شێوەیەک کە پیاوێک لە موسوڵمانان هاواری لە کەسێکی ئەوان کرد بێت بۆلای ئەویش چووە بەردەستی و دای لەملی، هەتا وای لێهاتبوو چەکەکانیان تەسلیم دەکردو دەچونە

بەردەســتیان بــۆی بکــوژرێن، بەم شــێوەیە ســوپای فــارس تەواو تێکشــکابوون و کەوتوبونە بەردەست موسوڵمانان))

رۆژی قادســیە بەســەرکەوتنی موســوڵمانان کۆتــای پێهــات، ژمــارەی شــەهیدەکانی موسـوڵمانان نزیکی هەشـت هەزارو پێنج سـەد شـەهید دەبـوون، وە ژمارەی کـوژراوانی فارس لە چل هەزار کەس زیاتر دەبوون.

سـەعد نـامەیەکی نـارد بـۆ عـومەر هەمـوو روداوەکـانی جەنگی تێدانووسـی بـۆی بەم شێوەیە:-

(خـوای گەورە سـەرکەوتنی پێ بەخشـین بەسـەر خەڵکی فارسـدا و بەهەمان شێوەی کە پێشـتر بە ئەهلی دینی بەخشـیبوو، لەدوای ئەوەی جەنگی زۆر قـورس و گـران و تونـد رویـدا لەنێوانمانـدا، بەشـێوەیەکی وا بەرەنگاری موسـوڵمانان بـونەوە کە هـیچ چاوێـک پێشـتر شـتی وای نەدیـووە، بەڵام خـوای گەورە بە سـودی موسـوڵمانان کۆتـای پێهێنـا، موسـوڵمانان شـوێنیان کەوتـن بەنـاو ئـاو وشـکانیدا بەجۆرێـک رایانـدەکرد لەدەسـت موسوڵمانان کە خۆمان باوڕمان نەدەکرد، لە موسوڵمانان سـەعیدی کوڕی عەبیدی قـاریئ و فـڵان و فـڵان وە پیاوانێـک لە موسـوڵمانان شـەهید بـوون ئـێمە نـازانین خـوای گەورە زانـاترە بە حاڵیـان، شـەوانە قورئانیـان دەخوێنـدەوە وەک مێش مەنگ سـەوتیان دەهات، ئەوانە لە پیاوە بەڕێزەکانی ئێمە بوون هیچ کەسم نەدیووە وەک ئەوانە بێت لە رابــردودا، هــیچ شــتێک شــایەنی ئەوانە نــیە مەگەر شــەهادەت، وە غەنیمەتەکــان بەشێوەییەکی رێک و پێک دابەشکراون و لێشی ماوەتەوە.

لەدوای ئەمە موسوڵمانان کەوتنە جوڵە بە ئاراستەی باکور چونە ناو کوفەوە بە بێ بەرەنگاربونەوە، بەم شێوەیە بەردەوام بون هەتا موسوڵمانان گەیشتنە شاری بهرسیر کە شارێکی قایم و توند و بەهێزبوو کۆتا قەڵابوو پێش گەیشتن بە مەدائین، موسوڵمانان گەمارۆیەکی درێژیان خستە سەریان، نزیکی شەش مانگی خایەند، بۆیەکەمجار موسوڵمانان چەکی فارسیان بەکارهێنا ئەویش هاویشتنی مەنجەنیق بوو بۆیان.

روداوێکی ناوازە: تەبەری بۆمان دەگێڕێتەوە لە ئەنیسی کوڕی حەلیس و دەڵێ: ئێمە کاتێک گەمارۆی بهرسیرمان دابوو، یەکێک لە گەورەکانی فارس وەک نوێنەر هات بۆلامان و وتی: مەلیک دەڵێت پێتان: ئایە ئێوە هاوپەیمانی دەبەستن لەگەڵمان بەو مەرجەی کە لەم دیو دیجلەو چیاوە بۆ ئێمەو ئەو دیو دیجلەو چیا بۆ ئێوە؟ ئایە ئێوەی عەرەب تێرناخۆن دەی یاخوا قەت تێرنەخۆن؟!

خەڵکە موسوڵمانەکە ویستیان جوابی بدەنەوە، بەڵام پێش هەموویان "ئەبو مەفزەر ئەسوەد کوڕی قطبە" وەڵامی دایەوە، بەڵام وەڵامەکەی وەک وەحیەکی خوای وابوو کە خۆشی نەیزانی چی دەڵێ و چۆن ئەوەی وت، نێردەری فارسەکان کە گوێی لە قسەکانی ئەبو مەفزەر بوو گەڕایەوە، پاشان موسوڵمانان بینیان کە روبارەکەیان بڕی و بەرەو مەدائین چوون، موسوڵمانان بە مەفزەریان وت: ئەی ئەبو مەفزەر ئەرێ تۆ چیت بەو نێردەرە وت؟ وتی: وەاللە خۆشم نازانم کە چۆن ئەو قسەیە هاتە سەرزمانم؟!، بەس هیوادارم کە شتێکم وتبێت کە خێری تێدابێت بۆمان، دواتر خەڵکەکە بووە جێگەی

سەرسامیان کە چۆن بە قسەیەک کە مەفرەز وتی هەموو شاری بهرسیر چۆڵکراو خەڵکەکەی رایانکرد بەرەو مەدائن؟

کاتێک خەڵکە موسوڵمانەکە چوونە شارەکە چۆڵکرابوو تەنها یەک کەس مابوو موسوڵمانان هاواریان لێکردوو پێیان وت کە ئەمانیان داوەتێ، پاشان لێیان پرسی ئەرێ هۆکاری چی بوو ئاوا فارس شارەکەی چۆڵکرد، پیاوەکە وەڵامی دایەوەو وتی: مەلیک کەسێکی نارد بۆ لاتان بۆ سوڵحکردن بەڵام ئێوە وەڵامتان دابۆوە کە سوڵح ناکەین هەتا هەنگوینی ئەفریزین نەخۆین[1]، کاتێک مەلیک ئەمەی بیست لێتان وتی: واوەیلا بۆخۆمان ئەمانە فریشتە لەسەر زمانیان قسەدەکات، ئیتر کە مەلیک ئەم قسەیەی کرد هیچ شتێک نەمایەوە تەنها ئەوەنەبێت کە رابکەن خەڵکەکەو مەلیکیش...

بەتەواوی موسوڵمانان بونە خاوەنی بهرسیر لە سەفەری ساڵی ١٦ هیجری

**پەڕینەوە لە دیجلە بە ئەسپەوە**

لە نێوان موسوڵمانان و مەدائینی پایتەختی فارسەکان تەنها روباری دیجلە مابوو بۆ ئەوەی بگەنە مەدائین، دیجلە روبارێکی خوڕ و قوڵ بوو بە نزیکی شەش مەتر، بەڵام سەعدی کوڕی ئەبی وەقاس دوودڵ بوو لەوەی کە ئایە لەم روبارە بپەڕێتەوە یان نا، بۆیە مایەوە لەسەر حەماسەتی موسوڵمانان کە ئایە چیبکەن، بەڵام لە کۆتایدا خوای

[1] دیارە ئەو جۆرە هەنگوینە زۆر نهێنی بووە و کەم کەس پێی ئاشنابووە و یان ناویان زانیووە، بۆیە کە مەلیک ئەمەی بیست سەری لەوە سوڕما کە چۆن ئەو شتانە دەزانن و پێی وابوو ئەوانە فریشتە وەحیان دەداتێ لەبەرئەوە ترساو بێ ئومێد بوو لەوی بەرگری بکات.

گەورە دڵی سـەعدی یەکلاکـردەوە لەوەی کە ڕێگەبـدات موسـوڵمانان بـپەڕنەوە بە ئەسـپەکانیانەوە بـۆ ئەوبەر، سـەرەتا چەنـد کەسـانێک پێشـنیاریانکرد کە ئەمـانە بپەڕێنەوە لێـواری ڕوبـارەکە هەتـا بـبەن پارێزگار بـۆ ئەوانیتر، لەوانەش عاصـم کـوڕی عەمر کە بـرای قەعـقەع بـوو، بەدوایـدا شـەش سـەد کەسیتر چـوون بـۆ نـاو ڕوبـارەکە لەکاتێکـدا دیجـلـە ئـاوەکەی زۆر خـوڕ و خێرابـوو، بەڵام ئەمـانە لەسـەر پشـتی ئەسپەکانیان زۆر بە جوامێرانە پەڕینەوە.

کاتێـک فارسـەکان ئەمەیـان بینی کەوا موسـوڵمانان بەسـواری ئەسـپەوە دێـنە نـاو ڕوبـارەکەو نزیکـی کەنـاری ڕووبـار بـونەتەوە، هەوڵیانـدا ڕێیـان لێبگـرن و نەهـێڵن بپەڕێـنەوە، بەڵام موسـوڵمانان توانیـان سـەربکەون بەسـەریاندا و بـگەنە لێـواری ڕوبـارەکە بە بێ ئەوەی کەسـیان لێ شـەهیدبکرێ، لەم کاتەدا سـەعد فەرمـانیکرد بە هەمـوو سـوپاکە کە خۆیـان ئامـادەبکەن بـۆ پەڕیـنەوەو بچـنە نـاو ڕوبـارەکە بە ئەسپەکانیانەوە وە پێشی وتن پێش پەڕینەوە بڵێن: (نستعين بالله ونتوكل عليه حسبنا الله ونعم الوكيل، لا حول ولا قوة إلا بالله العلي العظيم)...

خەڵکەکە لەکاتی پەڕینەوە هەتـا گەیشـتنە لێـواری ڕوبـارەکە بەردەوام ئەم زیکرەیـان دەوتەوە، وە سـەعد فەرمـانی پێکـردن کە دوو دوو بپەڕێنەوە هەتـا ئەگەر کەسێکیان نوقـوم بـوو ئەویتریـان فریـای بکەوێـت، سـەربازەکانی فـارس کاتێـک ئەم پەڕیـنەوەی موسـوڵمانانیان بینی زۆر سـەیریان لێهـات کە چۆن لەو ئـاوە خێراو قـوڵە ئەم ئەسـپانە پەڕینەوە، وتیان وەاللە ئەمانە مرۆڤ نین بەڵکو جنۆکەن و توشی ئێمەبوون!!.

سەلمانی فارسی لە کاتی پەڕینەوەکەدا بووە دراوسێی سەعدی کوڕی ئەبی وەقاص، ئەو دوانە پێکەوە چەند قسەیەکیان هەیە لەسەر ئەو پەڕینەوەیە کە بووە جێی سەرسامی دوژمن و خۆشیان بە سەرکەوتنێکی زۆر گەورەیان دانا، سەعد وتی: (سوپاس بۆ خوای گەورە کە ئەو نیعمەتەی پێ بەخشین ئەوەش تەقدیری خوای کارزان و کارجوانە، خوایەگیان ئێمە هەر تۆ پشت و پەنامانیت و پشت بە تۆ دەبەستین، بێگومانین لەوەی کە خوای گەورە دۆستان و وەلی خۆی سەردەخات بەسەر دوژمناندا، هەرگیز سوپایەکی تاوانبارو دەرچوو لەفەرمانی خوا زاڵ نابێت بەسەر سوپایەکی چاکەخواز و خێرخواز).

سەلمانیش وتی: (ئیسلام نوێیە، خوای گەورە زەلیلیان دەکات بۆمان لەم روبارەدا وەک چۆن خوای گەورە زەلیلی کردن لە وشکانی، سوێند بەو خوایەی کە گیانی سەلمانی بەدەستە وەک چۆن ئاوا دەچینە ئاوەکە بەو زۆری و پڕیە ئاواش لێی دێینەدەر)

گەورەکانی فارس رایانکرد بەرەو مەدائین، خەڵکەکەش کە مابونەوە لە ماڵی خۆیاندا جێگیربوون، موسوڵمانان کە چونە شارەکەوە تەواو چۆڵکرابوو، کاتێک سەعد چووە شوێنی حەسانەوەی کیسرا ئەم ئایەتەی خوێندەوە: ( كم تركوا من جنات و عيون * وزروع ومقام كريم * ونعمة كانوا فيها فاكهين * كذلك أورثناها قوما آخرين) [الدخان: ٢٥-٢٨]. موسوڵمانان لە مانگی سەفەر ساڵی ١٦ هیجری چونە ناو مەدائینەوە.

سەعد سەلمانی فارسی نارد بۆ لای فارسەکان هەتا بانگهێشتیان بکات بۆ دینی خوای گەورە، زۆربەیان لەسەر ئەوە بوون کە جزیە بدەن، وە ئەو غەنائیمەی هەبوو وەرگیرا، هیچ کەس لە سەربازانی موسوڵمان لەو هەموو پارەو ئاڵتون و غەنائیمەی دەستیان

کەوت خیانەتیـان بـۆ درهەمێـک تێـدانەکرد، مێـژوو نوسـانە دەگێـڕنەوە : کاتێـک موسوڵمانان دابەزینە ناو مەدائینەوە و هەموو ئەو غەنائیمانەی هەبوو کۆیانکردەوە، لەلایەن کەسانی تایبەت بەوکارە، پیاوێک لە موسوڵمانان هەموو ئەوەی لە لای بوو کە بە حەقی خـۆی وەریگرتبـوو یـان دەسـتی کەوتبـوو تەسـلیمی ئەو کەسـانەی کـرد کە غەنائیم کۆدەکەنەوە، ئەوانیش زۆر بەلایانەوە سـەیربوو وتیـان بەڕاسـتی هەتـا ئێسـتا هاوشێوەی ئەم کەسەمان نەدیووە، پێیان وت: تۆ کێی؟ وتی: سوێندبەخوا پێتان ناڵێم بـۆ ئەوەی ئەو پاداشـتەی خـوا ئەمـداتێ ون نەبـێ، کەسـێکیتر لەوان جـارێکیتر لێی پرسیەوە ئەرێ تۆ کێیت ناوت چیە؟ وتی: نا سوێند بەخوا پێتان ناڵێم بۆ ئەوەی دواتر وەسفم بکەن و بمناسێنن، من دەمەوێ خوای گەورە پاداشتم بداتەوەو وە لای خوای گەورە بناسرێم، دواتر کەسێک لەوان بەدوایدا چوو کەوتە پرسیارکردن لە خەڵکەکە کە ئەمە کێیە دەرکەوت ئەو کەسە "عامر کوڕی عەبد قیس" بووە.

هەروەها دەگێڕنەوە کە سەعد دەربارەی سوپای قادسیە وتویەتی:

(سـوێند بەخـوا ئەو سـوپایە لە لـوتکەی ئەمانەتـدابوون، مەگەر سـوپای بەدر وەک ئەوان بووبێـت لە نمـونەدا، وە هیـوادارم کە خـوای گەورە وەک ئەهلی بەدر سـەیریان بکات، ئەگەر بچینەوە بەدوای قەومەکان کە هەبوون هەرگیز هاوشێوەی وەک ئەوانت بۆ نادۆزرێتەوە) مەبەستی ئەهلی قادسیەیە کە کاتێک چوونە ناو مەدائینەوە.

موسـوڵمانان لە دیـوانی کیسـرا ژمارەیەکی زۆر لە کەنـزی ئاڵتونیـان دەسـتکەوت، بەڵام هەموویـان خسـتە نـاو بەیتـول مالەوە، ئەو راسـتگۆیەی کە لەگەڵ خـوای گەورە هەیـان بـوو کە خـوای گەورە گەورەتـرین مـوعجیزەی پیشـاندان لە کاتی پەڕینەوەی سـوپاکە لە

نــاو روبــاری دیجــله، بەڵام دوای دەســتکەوتنی ئەو هەمــوو پــارەو ســامانە دڵیــان لە خـواویسـتی نەگـۆڕاو وەک خۆیـان مـانەوە، هەر ئەو خـواویسـتیەش لای خـوای گەورە دەمێنێتەوە بۆیان، کاتێک غەنائیمەکان گەشیتەوە بە عومەر، خرایە سەر بەیتول مال و بەیتـول مـال زۆر زیـادیکرد، عـومەر لەوکاتەدا کەوتەگریـان، عەبدول رەحمـانی کوڕی عەوف وتـی: بـۆچی دەگـری ئەی ئەمیری بـاوەڕداران سـوێند بەخـوا ئەمە هی ئەوەیە دڵخۆشبین و سوپاسی لەسەربکەین.

عـومەر وەڵامـی دایەوەو وتـی: (سـوێند بەخـوا بـۆ ئەوە دەگـریم، وەاللە خـوای گەورە ئەمەی بەهەر قەومێــک بەخشــیبێت ئەوا ئەو قەومە حەســودی و بــوغزو قــین لەنێوانیاندا بڵاوبۆتەوە)

سەعد لەدوای ئازادکردنی مەدائین کۆمەڵێک کە ژمارەیان دوانزە هەزار کەس دەبوون نــارد بــۆ شــوێنکەوتنی فارســەکان کە کۆبوبــونەوە لە جەلەولا وە ســەرکەوتنیان بەدەستهێنا بەسەر فارسەکان لە مانگی ذي القعدة ی ساڵی ١٦ هیجری.

وە هێزێکیتری موسـوڵمانان توانیـان ناوچەکانی تکریـت و موصـڵ و نەینەواو رزگاربکەن کە لەسـەر روبـاری دیجلەن، وە هێزیتریش ناوچەکانی هیث و قرقیسیاء یان ئازاکرد کە لەسـەر روبـاری فـوراتن، وە هێزیتریش ناوچەکـانی الأبلـة و شـط العـرب و الأهـواز یـان ئـازاکرد، موسـوڵمانان لە سـاڵی ١٧ هیجریـدا گەیشـتنە شـاری کـوفە، لەدوای چـواردە مانگ لە جەنگی جەلەولاو کە ناوچەکە بووە شـوێنێکی سەربازی وە هەموو دەوروپشـتی جەلەولا ئــازدکرا و هەمــوو عەشــرەتەکانی عەرەب کە لەدەوروبەری کــوفە بــوون

نیشتەجێ بونەوەو ناوچەکە بەرەو ئارامی چوو، لە ساڵی ١٧ هیجریدا هەمان ساڵ جەزیرەش ئازاکرا...

### سکاڵاکردنی خەڵکی کوفە لەسەعد:

مێژوو نووسان دەگێڕنەوە: سەعد خانویەکی هەبوو لە کوفە کە دەرگایەکی تێداکردبوو وە بەردەوامیش ئەو دەرگایە داخرابوو، هۆکاریش ئەوەبوو کە خانوەکە لەناو بازاڕدابوو لەبەر بونی ژاوەژاو دەنگەدەنگ سەعد دەیویست کە ماڵەکەی بێدەنگ بێت، هەتا ئەو کەسانەی دێنە لای بە باشی گوێیان لێبگرێ و لێیان تێبگات، ئەمە گەیشتەوە بە عومەر، کە سەعد دەرگای لە خەڵکی داخستووەو لە ماڵی خۆیدا دانیشتووە، عومەر کە ئەمەی بیست توڕەبوو، "محمدی کوڕی مەسلەمە"ی راسپارد کە هاوەڵی پێغەبەر صَلَّى الله عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ بوو بۆ ئەوەی بچێت بۆ کوفە پێی وت: بچۆ بۆ ماڵی سەعد دەرگای ماڵەکەی بسوتێنەو پاشان بگەڕێوە ئەو شوێنەی کە پیای هاتی، محمدی کوڕی مەسلەمە دەرچوو بەرەو کوفە هەتا گەیشتە ناو کوفە و وە پێشتریش هیچ پەیوەندیەکی بە سەعدەوە نەکرد کە دێت بۆ ئەوێ، لەبازاڕ ئەو شتەی کڕی کە لەو زەمەنەدا بەکار دەهات بۆ کردنەوەی ئاگر وە راستەوخۆ چووە ماڵی سەعد و ئاگری لە دەرگاکە بەردا، بە سەعدیان راگەیاند کە نێردەرێک هاتووە ئەم کارەی ئەنجام داوە، ناردی بەشوێنیدا کە بزانێ کێیەوە بۆچی ئاوای کردووە؟ کەزانی محمدی کوڕی مەسلەمەیە ناردی بەشوێنیدا بەڵام نەهات، سەعد بۆخۆی چوو کە بانگی بکات بێتە ژور بەڵام نەهات، پاشان داوایانکرد کە بێتەژور پشویەک بدات بەڵام قبوڵی نەکرد، محمدی کوڕی مەسلەمە نامەکەی عومەری دەرهێناو دای بەسەعد کە تیایدا نوسرابوو:

(پێیان راگەیاندوم کە تۆ ماڵێکت دروستکردووەو دەرگات لێداوەو ناوت لێناوە کۆشکی سـەعد، لە نێـوان خـۆت و خەڵکی دەرگات دانـاوە واتە خـۆت لێجیـاکردونەتەوە، ئەوە کۆشـک نـیە ئەوە نەگبەتـیە تـۆ دروسـتتکردووە، لەوەی دروسـتتکردووە بـۆ خـۆت وازی لێبێنـە هەرگیز لەنێـوان خـۆت و خەڵکیـدا بـا دەرگانەبێت، بـا خەڵکی بە ئـازادی بێن بـۆ سـەردانت و سـكاڵای خۆیـان بـكەن، بـۆ ئەوەی تـۆش مـاف و حەقی خۆیـان بـۆ وەربگریتەوە)

ئەوانەی لەدەوری سـەعد بـوون وتیـان: ئەمە کێ ئەم قسـانەی کـردووە؟!، محمدی کـوڕی مەسـلەمە راسـتەوخۆ گەڕایەوە بـۆ مەدیـنە وەک چـۆن عـومەر پێی وتبـوو، هەتـا ئەو خـواردنەی پێی بـوو تەواو بووبـوو، بـۆیە کەوتبـووە خـواردنی گژوگیـا، بەو شـێوەیە گەیشـتەوە لای عـومەر کە لە بێ خـواردنی زۆر توشی نـارەحەتی بووبـوو، کاتێک چـووە لای عـومەر هەرچی بینیبـوو یـان بیسـتبووی بـۆی گێڕایەوە، عـومەر وتـی: محمدی کـوڕی مەسـلەمە یەکـێکە لەو پیـاوانەی کە لە وەسـفکردنی بێتـاقەت نـابم چـونکە کاتێـک ئەرکێکی پێدەسپێریت زۆر بە جـوانی و بەوپەڕی هیمەتەوە جێبەجێی دەکات، وە باسی لە حاڵ و باری سەعد کردوو عومەریش قسەکانی بەڕاست زانی و وە وتیشی لە سەعد هەر ئەوە چاوەڕێ دەکرێت، سـەعد بەدڵنیـایەوە ئەوەی لەسـەریان وتـووە راسـت نـیە، بەڵام خەڵکی کوفە سکاڵایان لەسەر کردووە بۆیە ئێمەش ئەم کارەمان ئەنجامدا

**لابردنی سەعد:**

بەڵام عــومەر لەدوای ئەوەش کە دڵنیــابوو ســەعد لەســەر حەقە لایبــرد، چــونکە دەیویسـت سـەعد توشی نـاڕەحەتی نەبێت بەدەسـت خەڵکەوە و وە بشـگەڕێتەوە لای خۆی لە مەدینە هەتا وەک راوێژکارێک لەدەوری بێت.

لەدوای ئەوە عبداللە کوڕی عبداللە کوڕی عتبان، نامەیەکی نارد بۆ عـومەر داوایلێکرد کە هێزێکی گەورە بنێرێ بـۆ نەهاوەنـد، چـونکە سـوپای فـارس لەوێ کۆبووبـوونەوە و خۆیان ئامادە کردبوو بـۆ هێرش کە ژمارەی سـوپای فـارس سـەد و پەنجـا هەزار کەس دەبـوون، وە لە نامەکەشـدا ئەوەی بـۆ عـومەر باسـکردبوو کە هێـزەکە بە قــوەتێکی سەربازی زۆرەوە هاتوون بۆیە دەبێ ئێمەش بە خێرای خۆمان ئامادەبکەین بۆ جەنگ.

**جەنگی نەهاوەند:**

لە پاش ئەوەی کە عـومەر بڕیاریدا بە ئازادکردنی نەهاوەند، بیری لەوە دەکردەوە کە کێ بکات بە سەرکردایەتی ئەو سوپایە، بۆیە کەوتە راوێژکردن بە هاوەڵانی دەوروبەری، لە کۆتایدا بڕیاریدا بە دانانی "النعمان بن مقرن المزنی" و وتی:

(سـوێند بەخـوا ئەمە یەکەمـین جـارە کەسـێک دابنـێم بـۆ کـار جێبەجێکـردن کە لە راپەڕانـدنی کـاردا زۆر خێرایە، ئەو پیـاوەش پیـاوێکی لەسـەر خـۆو خـاوەن ئیرادەیەکی پـۆڵاینە، کە نـاوی النعمـان بـن مقـرن کاتێـک ویسـتی کارێکبکـات راسـتەوخۆ جێ بەجێ دەکات) کاتێک نوعمان پۆستەکەی وەرگرت وەک سەرکردەی سوپای موسوڵمانان بۆ ئازادکردن نەهاوەند هەوڵیدا لەرێی هەواڵگریەکانیەوە بزانێ فارسەکان خەریکی چین و پلانیـان چـیە؟ کاتێـک هەواڵـی پێگەیشـتەوە بـۆی دەرکەوت فارسـەکان بەدەوری

شـــارەکەدا بـێجگەلە قەڵاو خەنــدەق کە کردویــانە، کۆمەڵێــک ئاســنیان بە زەویــدا چەقانـدووە بە دەوری شـارەکەدا مەتـا ئەگەر موسـوڵمانان هێرشیانکردەسـەر قەڵاکە ئەوا بچێـت بە قــاچی ئەسـپەکانیان و خۆیانــدا، لەبەرئەوە هێرشــکردنە ســەر شــاری نەهاوەند بەم شێوەیە کارێکی قورس و پشتشکێنە.

**موسوڵمانان کەوتنە دانانی پلانێک بۆ فارسەکان مەتا کۆتاییان پێبێنن:-**

**پلانەکەش بەم شێوەیە بوو:-**

- سەرەتا موسوڵمانان کۆمەڵێک لە ئەسپ سوارەکان بنێرن بۆ دەوری شارەکەو بکەونە هێرشی فارسەکان مەتا بجوڵێن و بێنە پێش بۆ موسوڵمانان.
- پاشــان ئەو کــۆمەڵەی هێرشـــەکەیان کــردووە وانیشـــانبدەن کە شــکاون و دەیانەوێ بگەڕێنەوە بۆ دواوە.
- بەشـێکیتری سـوپای موسـوڵمانان لە شـوێنێکدا بووەسـتن کە دەبێـتە شـوێنی گەڕانەوەی موسوڵمانان.
- کاتێک کە موسوڵمانان گەڕانەوە بە تەئکیـد فارسـەکان دوایان دەکەون و لەو چوارچێـوەیە دێـنە دەر کە خۆیــان وەک پــلان کێشــاویانە، لەم کـاتەدا موســوڵمانان دەکەونە پەلاماردانی سوپای فارس.

وە ســەرکەوتوش بــوون لەو پــلانەی کە دایانــا مەتــا فارســەکان کاتێــک بینیــان کە موســوڵمانان دەکشـێنە دواوە هاواریـان لەیەکـدەکرد موسـوڵمانان شـکان و بەزیـن، شـوێنیان کەوتن مەتا فارسەکان لەو چوارچێوەیەی دروستیانکردبوو لە دڕکی ئاسنین و خەنــدەقەکە دەرچــوون، لە ســەرەتای بەیانیــدابوو نوعمــان بە خەڵــکەکەی وت

شوێنپێی خۆتان قایم بکەن مەجوڵێن هەتا من فەرمانتان پێدەکەم، واشیانکرد خۆیان شـاردەوە لەسـەر سـک پـاڵکەوتبون لەترسـی رمەکـان، فارسـەکان لە دورەوە تیریـان دەهاویشـتە موسـوڵمانان هەتـا هەنـدێکیان برینـداربوون بەو تیرانە، بـۆیە هەنـدێکیان ئارامیان نەماو وتیان بە نوعمان ئەرێ نابینی چیمان لێدەکەن؟ هەتاکەی ئاوا چاوەڕێی بکەین و بمێنینەوە؟ نوعمان وەڵامی دانەوەو وتی: هێواش هێواش ئارامبگرن!!

کاتێـک کـات بـووە نـوێژی نیـوەڕۆ، نوعمـان سـواری ئەسـپەکەی بـوو وە خەڵـکەکەش بەهەمان شێوە وایانکرد و پێی وتن: (چی شتێک ڕێگرەلەوەی کە من خۆم ئاگاداری ئەوە بـــووم پێغەمـــبەر (صَـــلَّى اللهُ عَلَيْـــهِ وَسَـــلَّمَ) لەکـــاتی غەزادا هەرگیـــز بەیانیـــان دەستیپێنەدەکرد بەڵکو چاوەڕێی دەکرد تا نوێژی نیوەڕۆ دەهات پاشـان نـوێژی دەکـرد و دەستپێدەکرد، جا ئێمەش بۆ ئاوا نەکەین)

پاشـان بە خەڵـکەکەی وت: (کاتێـک نوێژمـان کـرد خۆتـان حـازربکەن، مـن سـێ جـار بانگتـان دەکەم، کاتێک کە دەنگی یەکەمتـان بیسـت لە ئامـادە باشـیدابن، هەمووتـان خۆتـان تونـدوتۆڵ و ئامـادەبکەن، کاتێـک کە گوێتـان لە دووەم بـوو کەل و پەلتـان حـازربکەن و ئامـادەی هەسـتان بـن، کاتێـک گوێتـان لە سـێیەم بـوو مـن دەردەچـم بـۆ جەنـگ ئێـوەش بەدوامـدا دەسـتپێبکەن، ئەگەر مـن کـوژرام ئەوا لەدوای مـن حـوزەیفە ئەمیرە وە ئەگەر ئەویش کوژرا فڵان کەسـە هەتـا شـەس کەس ڕۆیشـت کۆتاییەکەیـان موغەیرەی کوڕی شـوعبە بوو).

نوعمـان و سـەربازەکان نـوێژی نیوەڕۆیـان کـردوو تەکبیری یەکەم لێدرا، پاشـان دووەم لێـدراو دەسـتی بەرزکـردەوە بـۆ دۆعـاو وتـی: (خـوای گەورە داوات لێـدەکەم ئەم دینـە

سەربخەییت وە بەندەی خۆشت سەربەرزبکەیت وە نوعمان بکەیتە یەکەم شەهیدی ئەمڕۆ، لەپێناو سەربەرزی دینی جەنابت، خوای گەورە داوات لێدەکەم چاومان بە بینینی سەرکەوتنی ئەمڕۆ شادبکەییت و ببینین کە دینەکەمان سەربەرزە، بڵێن ئامین رەحمەتی خواتان لێبێت)

پاشان تەکبیری سێیەم لێدراو جەنگ دەستیپێکرد، جەنگێکی گەرم لەنێوان هەردولا بەرپابوو، نوعمان بریندار بوو دابەزی لەسەر ئەسپەکەی، وە ئاڵاکەی دا بە براکەی نەعیم کوڕی موقرن و وە ئەمیرێتیەکەشی تەسلیمی حوزەیفەی کوڕی یەمان کرد، ئەوڕۆژە شکست روینەدا هەتا موسوڵمانان سەرکەوتن بە سەرکەوتنێکی گەورە.

موعقل کوڕی یەسار هات لەکاتێکدا نوعمان بە خۆی و ئەسپەکەی لە شوێنێکدا پاڵ کەوتبون خۆڵ و تۆز داپۆشیبوون، موعقل خۆڵ و تۆزەکەی لەدەم و چاوی نوعمان لابرد. نوعمان وتی: تۆ کێی؟ وتی: موعقل کوڕی یەسار، نوعمان وتی: ئەرێ خەڵکەکە چیان کرد؟ وتی: خوای گەورە فەتحی کرد بۆمان، نوعمان وتی: الحمدلله، نامەیەک بنوسە بۆ عومەر و پاشان گیانی دەرچوو، رەحمەتی خوا لە نوعمان بێت پیاوی رۆژگاری سەخت.

**سەربازەکانی خوای گەورە نازانرێ کێن مەگەر خوا خۆی بزانێ:**

قەعقەعی کوڕی عەمر بینی وا فەیرەزان کە سەرکردەیەکی فارسە دەیەوێ هەڵبێ و راکات لە جەنگەکە، قەعقەع لەگەڵ نەعیمی کوڕی مقرن شوێنی کەوتن، لە شوێنێک کە ناوی "ثنیة همدان"ە پێی گەیشتن کە دۆڵێکی تەسکە، لەوێدا رێیان لە قافڵەیەکی گەورەی هەنگوین دەکەوێ کە بەسواری ئێستر و کەر هێنراوە هەتا ببرێت بۆ یزدجرد،

بەڵام ئەم قـافڵەیە دەبێـتە هـۆی رێگـری لە دەربـاز بـونی فەیـرەزان لە دۆڵەکەدا، پـێش ئەوەی دەربچێ قەعـقەع پێی دەگات و دەیکوژێ، دواتـر قەعـقەع دەڵێ: خـوای گەورە سـەربازی وەک مەنگوینی هەیە، سـەربازی موسـوڵمانان مەنگوینەکەیـان مەڵگـرت بـۆ خۆیان و دواتر ئەو شوێنە ناوەکەیان لە ثنية همدانەوە گۆڕی بۆ ثنية العسل.

یەکێک لە مێژوو نووسـەکان کە زانیـاریەکی باشی هەیە لەسـەر پلانی سـەربازی، دەڵێ: پلانی جەنگی نەهاوەند کە لە پێشنیاری "طليحة بن خويلد الأسدي" بوو، وانەیەکی زۆر گەورەی لە مێژووی جەنگدا تێدایە، لەدوای ئەو پلانەی طليعه هەمـوو سـەرکردەکانی تـر کە دەهـاتن ئیشـیان لەسـەر ئەو پلانە دەکـرد، هەر ئەم پلانە گەورەیە جەنگیزخـان سـەرکردەی دیاری تەتەرو مەغۆلەکان لە کۆنترۆڵ کردنی ئاسیادا لە رۆژهەڵاتەوە بـۆ رۆژئاوا ئیشی لەسـەر ئەم پلانە کـردووە، هێرشی گەورەی دەکـرد بە مەبەستی ئەوەی کە ریزی دوژمن و تـرس بکاتە دڵیـانەوە، کە سـەیری دەکـرد ئەم کارە جێ بەجێ نـابێ دەهـات پاشەکشـێی دەکـرد بەشـێوەیەک کە هەسـتبکەن تێکشـکاون، هەتـا دوژمـنەکەی دەخسـتە ئەو شـوێنەی کە خـۆی پلانـی بۆدانـاوە، ئیتر دوژمـن کە شـوێن سـەربازەکان دەکەوت دواتـر هێرشـێکی تـری گەورەی دەخسـتەوە سـەر دوژمـن و توشـی شـپرزەیی و روخـانی دەکـردن، وە هەروەهـا بەهەمـان پلانیش بـوو کە "سـەیفەدین قطـز" لە جەنگی عەین جالوتدا تەتەرەکانی تێکشکان، تەتەرەکان یەکەمین جار بوو کە شکست بهێنن بەم پلانە چونکە پێشبینی پلانی وایان نەدەکرد کە خۆیان بەکاریان هێنـاوە، ئەم جـۆرە پـلانە لە زانسـتی جەنگـدا وا پێناسـە دەکـرێ کە کەمینـدانان و گـۆڕینی کەمینەکـان لە هێرشـەوە بۆ بەرگری و بە پێچەوانەشـەوە.

جەنگی نەهاوەند جەنگێکی یەکلاکەرەوە بوو لەنێوان موسوڵمان و فارسەکان، چونکە لەدوای ئەو جەنگی هێـزی فـارس ئەو شــەوکەتی ئیمبراتــۆریەتەی نەمـا، لەم کـاتەدا عـومەر بڕیاریـدا کە هێرشـی بەردەوام بکـاتە سـەر ناوچەکـانی فـارس، بـۆ ئەمەش نـۆ سـوپای ئامادەکرد بـۆ ئازادکردنی ناوچەکانی فـارس لەیەک کاتـدا، لە خۆراسـانەوە بـۆ بـاکوری روژهەڵات و ناوچەکانی فـارس لە باشـوری رۆژئـاوا، لە ئازەربایـنجانیشـەوە بـۆ بـاکوری رۆژئـاوا و ناوچەکانی باشـوری رۆژهەڵات، هەتـا سـاڵی ٢٢ هیجـری هێرشـەکان بەردەوام بــوون، هەتــا هەمــوو پارچەکــانی نــاوچەی فــارس کەوتە ژێــر حــوکمڕانی ئیسلامیەوە.

## کۆتای کیسرا یزدجرد و لەناوبردنی ستەمکارانی سەر زەوی:

لە ســاڵی ٢٢ هیجریــدا "ئەحــنەف کــوڕی قەیــس" پێشــنیاریکرد بــۆ عــومەر ئەمیـری بـاوەڕداران کە فەتحی ناوچەکـانی خوراسـان بکـات، کە نـاوچەیەکی گەورەو فـراوانە دەکەوێـتە رۆژهەڵاتـی فارسـەوە، هەتـا بە فەتحکردنـی ئەوێ تەنـگ بە کیسـرا یزدجـرد هەڵبچنن، لەبەر ئەوەی تـاکە شـوێن مـابوو کە لەوێـوە هێزی فـارس دابینـدەکراو دەنێرا بۆ جەنگ دژی موسوڵمانان.

کاتێـک یزدجـرد بەمەی زانـی کە موسـوڵمانان بەنیـازن بێـنە پێشـەوە، نـامەی نـارد بـۆ مەلیک "الصغد" تا هاوکاری بکات، وە نامەشی نارد بۆ مەلیکی صین بەهەمان شێوە بۆ پشـتیوانی، وە نامەشی نـارد بـۆ خاقـان مەلیکی تـورک بـۆ هاوکاری لە دژی موسـوڵمانان، بەڵام هیچ لەوانە هاوکاریان نەکرد.

ئەحنەف چووە ناوچەی خۆراسان و توانی شار بەشار بەدوای یەکدا ئازادی بکات، وە یزدجرد هەموو جارێک لە شارێک بۆ شارێکیتر رایدەکرد، هەتا یزدجرد بە ناچاری لە روبارەکە پەڕیەوە...

ئەحنەف توانی هەموو خۆراسان ئازادبکات، وە لە هەموو شارێک کە ئازادی دەکرد ئەمیرێکی دەکردە بەرپرسی شارەکە، پاشان نامەی نارد بۆ عومەر، تیایدا نوسی کە کۆتای بەو ناوچانە هاتون کە دەکەوێتە پشت روبارەکانەوە، وە عومەر پێی وت: پارێزگاری بکە لەوەی کە هاتۆتە بەردەستت ناوچەکانی خۆراسان بپارێزە.

یزدجرد بە ناچاری چووە ناوچەکانی پشت روبارەکە وە داوای پشتیوانیکرد لە مەلیکی ئەو ناوچەیە بەڵام گوێیان پێنەدا، کاتێک یزدجرد بەتەواوی چووە ناوچەکە مەلیکی تورک کە خاقان بوو بە پیریانەوە چوو چونکە لە شەرعی ئەواندا نەبوو کە پشتی خەڵک نەگرن کە هاتە ناوچەیان، یزدجرد بە خۆی و سوپاکەیەوە چوون بۆ لای خاقان و ئەویش هێزی پشتیوانی لەگەڵ ناردن، ئەحنەف لەم کاتەدا بەهەموو سوپاکەی لەگەڵیبوون بیست هەزار کەس دەبوو، بۆیە ئەحنەف چووە ناو خەڵکەکەو وتی: (بەدڵنیایەوە ئێوە کەمن لەچاو ژمارەی دوژمندا، بەڵام خوای گەورە دەفەرموێت (فكم من فئة قليلة غلبت فئة كثيرة بإذن الله و الله مع الصابرين)).

لە کەلتوری تورکدا ئەوە هەبوو کە ناچنە دەر بۆ جەنگ هەتا ئەو شوێنە نەپشکنن، بۆ ئەمەش سێ کەس لە پیاوانی ئازاو گەنجیان دائەنا بۆ ئەم کارە، یەکەمیان بە پێدا کێشان بە تەپڵێکدا دەڕۆی پاشان دووەمیش بە تەپڵێکیتر پاشان سێیەمیش بەهەمان شێوە پاشان لەدوای سێیەم هەموویان دەردەچون...

ئەحـنەف کـوڕی قـیس لەگەڵ کۆمەڵێـک لە هاوەڵەکانی شـەوێک دەرچـونە دەر مەتـا بزانن شوێنی کافرەکان لەکوێیەو چەند دورن لێیانەوە، کاتێک نزیکی بەیانی بونەوە سێ کەســەکەی کە بە تەپڵەکـان دەرچوبـون ئەحــنەف هەرســێکیانی کوشــت، کاتێـک تورکەکـان دەرچـونە دەر بینیـان کە هەرسـێکیان کـوژراون، مەلیکیـان لەمە ئاگـادار کردەوە ئەویش وتی: جەنگکردن لەگەڵ ئەم قەومە خێری تێدانیە بۆیە بڵاوەی لێبکەن.

کیسـرا ئەمجـارەش بە شکسـتەوە گەڕایەوە، پێی وابـوو ئەمجـارە سـەرکەوتودەبێ بە پشتیوانی تورکەکان، لەم کاتەدا نەیدەزانی روبکاتە کوێ؟!

هەنـدێک لەو کەسـانەی لەدەوری بـوون لە خەڵـکە تێگەیشـتوەکانی پێشـنیاریان کـرد بـۆی کە لەگەڵ موسـوڵمانان هاوپەیمـانی ببەسـتێ، ئەوان ئەمـان بـدەنەوە بە ئـێمە و بچینە زیمەتی ئەوان، ئێمەش لەبری ئەوا جزیەیان ئەدەینێ بۆ هەندێک لەو شارانە کە دێتەوە لامان، ئەمەش باشترە بۆ ئێمە، بەڵام کیسرا رەتیکردەوە ئەم پێشنیارە.

پاشـان نـامەی نـارد بـۆ مەلیکی صـین کە پشـتیوانی بکـات، مەلیکی صـین پرسـیاری لە نێردەرەکەی یزدجـرد کـرد دەربـارەی موسـوڵمانان، نێردەرەکەش وەڵامی دایەوە و بـۆی باسکردن کە چۆن نـوێژ دەکەن وە چۆن جەنگ دەکەن، مەلیکی صین نـامەی نارد بـۆ یزدجـرد و وتـی: دەتـوانم سـوپایەکت بـۆ بنێرم کە لێرەوە مەتـالایتۆ ببێـت، بەڵام ئەو کەسانەی کە نێردەرەکەی تۆ وەسفی کردوە بۆمان مەبەستم موسـوڵمانانە ئەوا ئەگەر بە گژ شاخێکدا بچن تەختی دەکەن بۆیە پێم باشـە لەگەڵیاندا رێکبکەویت ئەوەش بۆ چونی منە بۆ ئەم کارە.

یزدجـرد وئەوەی لەگەڵیـدا بـوون رایـانکردو رۆیشـتن بە پێ، هەنـدێک لە خەڵـکەکەی خۆی پرسیاری پارەو سـامانەکەیان دەکرد لێی ئەویش ترسا ووەڵامی نەدانەوە، جارێکی تـر خەڵکی نـارد بـۆ لای تورکەکان ئەوانیش گاڵتەیـان پێکرد و نێردەرەکەشیان کوشـت، ئیتر رایکـرد ئەمجـارە هەتـا گەیشـتە مـاڵی پیاوێـک کە ئـاردی دروسـتدەکرد لە لێـواری روبارێـک، بـۆ شـەو لەوێمـایەوە کاتێـک خەوت کـابرا کوشـتی بـۆ ئەوەی جـل و بەرگ و پۆشـاکەکەی بـدزێ، کاتێـک تورکەکـان هـاتن بەشـوێنیدا بگەڕێـن بینیـان کـابرا کوشتویەتی، ئیتر کیسرایان کردە تابوتێکەوەو هێنایانەوە بۆ ئەوەی بینێژن، ئەمە کۆتا مەلیکی فارسەکان بوو ئیتر دوای ئەوە فارس مەلیکی نەبۆوە، پێغەمبەر صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَـلَّمَ کە بوخـاری بۆمـان دەگێـڕێتەوە و دەفەرمـوێ: ئەگەر قەیسـەر کەوت ئیتـر قەیسەری تـر دروست نابێتەوە، ئەگەر کیسرای کەوت کیسرای تر دروست نابێتەوە، سـوێند بەوەی گیـانی منی بەدەسـتە مـاڵ و سـامانیان دەبەخشـرێ لەپێنـاو خـوادا) لەدوای دوو ساڵ لە حوکمی عوسمان قەیسەریش دەکوژرێ.

## هەڵوێستانێکی عومەر کە گرنگە بیربخرێتەوە:

ئەسـلەم دەگێـڕێتەوە کە خزمەتکـاری عـومەری کـوڕی خەتـاب بـوو و دەڵێ: شـەوێک لەگەڵ عـومەر دەرچـوینەدەر هەتـا بگەڕێین بەسـەر خەڵکی مەدینەو دەوروپشـتی، لە دورەوە ئاگرێکمـان بەدی کـرد عـومەر وتی : مـن ئەو ئـاگرە بەدی دەکەم بـابچین بـزانین کێـیە؟ کە بەم شـەوە درێـژو سـاردە لەدەرەوە دەژی، رۆیشـتین بە رۆیشـتنێکی بەپەلە بەرەو ئـاگرەکە، کاتێـک گەیشـتینە شـوێنەکە بینیمـان کە ئافرەتێـک لەگەڵ چەنـد منداڵێکدا لەوێن کە دەوری ئاگرەکەیانداوە، منداڵەکان دەگرین، عومەر سەلامیکردو

پاشان پرسیاریکرد لە ئافرەتەکە و وتی ئەرێ ئەوە چیدەکەن لێرە؟ ئافرەتەکە وتی: لێرە شەو بەسەردەکەینەوە لەم سەرمایە.

عومەر وتی: وتی ئەی ئەو منداڵە بۆ دەگری؟ ئافرەتەکە وتی: برسییەتی.

عومەر وتی: ئەی شتێک نیە بیدەیتێ؟ ئافرەتەکە وتی: بێدەنگ نابێ هەتا ئەخەوێ لەبرساو هیچیش نیە بیدەمێ خوای گەورە خۆی ئاگادارە کە عومەر لێمان بێخەمە.

عومەر وتی: رەحمەتی خوات لێبێ عومەر چوزانێ کە تۆ ئاوایت، ئافرەتەکە وتی: پۆستی وەرگرت و پاشان ئێمەی لەبیرکرد.

عومەر وتی: دەرچۆ با بڕۆین، بەخێرای رۆیشتین تا گەیشتینە گەنجینەی بەیتول مال، بەپەلە کیسەیەک ئاردی دەرهێنا لەگەڵ زەیت، وتی: بیدە بە کۆڵمدا، وتم من هەڵیدەگرم.

وتی: ئەرێ لە رۆژی قیامەت تۆ دەتوانی تاوانی من هەڵبگری؟

نەخێر، دەی کەواتە بیخە کۆڵم، دەرچوین بە خێرای بەرەو لای ئافرەتەکە، کاتێک گەیشتین بە ئافرەتەکەی ووت: کە ئاردەکە بخەناو مەنجەڵەکەو منیش تێکی ئەدەم، ئەوەندە نزیک ببوەوە لە ئاگرەکە بۆ ئەوەی فویلێبکات و بیگەشێنێتەوە دوکەڵ و تەپ و تۆز تەواو ریشیانی داپۆشی بوو، پاشان دایگرت و بە ئافرەتەکەی وت کە بیخەرە ناو قاپەوەو منیش ساردیان دەکەمەوە تا زوو بیدەین بە منداڵەکان، ئیتر خواردنەکەیدا بە منداڵەکان و ئافرەتەکەش زۆر دۆعای خێری بۆکردن، وتی: بەڕاستی دەبوو تۆ لە

شـوێنی خەلـیفەدا بی، عـومەر پێی وت: قسـەی خێربکە باشـترە، ئەگەر هـاتی بـۆ لای خەلیفە لەوێ من دەبینی ان شاء الله.

پاشـان دورکەوتینەوە لێیـان و چەنـد هەنگاوێک رۆیشـتین و پاشـان وەسـتا و وتی: نـاڕۆم هەتا گوێم لێیان نەبێ کە خەوتون و ئیسـراحەتیان کـردووە، پاشـان خەوتن و بێدەنگ بون، وتی سـوپاس بۆخـوا پاشـان وتی: ئەی ئەسلەم برسێتی شـەوی لێزرِندبون و گریانی کردبووە میوانی ماڵیان، ئێستا دڵخۆشم کە ئاوا بەجێیم هێشتن.

## هەڵوێستێکیتر...

شـەوێک کە عـومەر تێدەپەڕی بەنـاو مەدینەدا، لەبەردەم ماڵێکدا پیاوێک دانیشـتبوو وە دەنگـی گریـــان و نـــاڵەی ئـــافرەتێکیش دەهـــات لە ژورەوەی مـــاڵەکە، عـــومەر سەلامیکردوو پرسی لە پیاوەکە کە خەڵکی گوندنشین بوو هاتبوو هەتا عومەر هاوکاری بکات ئەرێ ئەو دەنگە چیە لەژورەوە؟

کابرا جـوابی دایەوەو وتـی: ئەوە پەیوەنـدی بەتـۆوە نـیە، بـڕۆ ڕەحمەتـی خـوات لێبێـت، عومەر جارێکیتر پێداگریکرد لێی کە پێی بڵێی چیە؟ کابرا وەڵامی دایەوەو وتی: ئافرەتێکە وەختی منـداڵ بـونیەتی کەس نـیە هاوکـاری بێـت، عـومەر بە پەلە گەڕایەوە مـاڵێ و بە خێزانەکەی وت کە ئـوم کەلسـوم بـوو کچی ئیمـای عەلی ئەرێ دەتەوێ خـوای گەورە خێرێکی گەورەت بداتێ؟ ئوم کەلسوم وتی: چیە ئەو شتە؟

عـومەر روداوەکەی بـۆ باسـکردو تێی گەیانـد، ئەویـش کـۆمەڵێ کەل و پەل و خـواردنی حـازرکرد و لەگەڵ عـومەر دەرچـون لەمـاڵ بـۆ لای ئافـرەتەکە، کاتێـک گەیشـتینە ئەوێ خێزانـــی عـــومەر چـــووە ژورێ و عـــومەریش لەدەرەوە لەگەڵ کـــابرا مـــایەوەو کەوتە

کردنەوەی ئاگرو دروستکردنی خواردن کابراش دانیشتووەو ناشزانێ ئەمە خەلیفەی موسوڵمانانە.

کاتێک منداڵەکە بوو خێزانی عومەر لە ژورەوە وتی موژدە بێت ئەی خەلیفەی موسوڵمانان کوڕێک لەدایکبوو، کاتێک کابرای دەشتەکی گوێی لەمەبوو سەرسام بوو، شڵەژاو دورکەوتەوە لە عومەر، عومەر وتی هیچ مەشڵەژێ و لەشوێنی خۆت دابنیشە، پاشان خواردنەکەی بۆ حازرکردوو دای  بە کابرا وتی بچۆ بیدە بە خێزانت، کاتێک ئوم کەلسوم هاتەدەر عومەر بە کابرای وت پێش ئەوەی بچێتەژوور وتی کە سبەی وەرە سەردانم بکە مەتا هاوکاریت بکەین.

**نامەی عومەر بۆ ئەبو موسای ئەشعەری:**

عومەری کوڕی خەتاب لەو ناوچانەی لەژێر حوکمڕانی ئیسلامدا بوون قەزای دانا بۆیان، بۆ نمونە لە کوفەو بەصرەو شام و میصر، لە مەندێک شوێن پیشەی قەزای بە سەربەخۆ دانابوو وەک عبداللە کوڕی مەسعود لە کوفە کە قازی ئەوێبوو، یان هەردوکی کۆکردبوۆوە هەم قازی و هەم ئەمیر وەک ئەبو موسای ئەشعەری لە بەصرەدا، عومەر نامەی دەنارد بۆ ناوچەکان و وەسیەتی بۆ دەکردن کە سیستەمی قەزا چۆنەو رونکردنەوەی بۆ ئەدان لەسەری.

وەک ئەم نامەیەی کە بۆ ئەبو موسای ئەشعەری  ناردووە...

بسم الله الرحمن الرحيم...

لە بەندەی خوا عومەر خەلیفەی موسوڵمانان بۆ بەندەی خوا عبد الله کوڕی قەیس سلام علیکم.

قەزاوەت کارێکی گەورەو واجبێکی موحکەمە وە ڕێگایەکی بەردەوامە، ئەو بەڵگەو دەلیلانەی کە بۆت دێ باش لێیان حاڵی ببە چونکە سودی نابێ قسەکردن بە حەق وە حوکمەکەشی جێی خۆیناگرێ.

جیاوازی مەکە لەنێوان خەڵکیدا بە شێوەو شکڵ و پلەو پۆست و خاوەن عەشرەت، هەتا ئەوەی خاوەن دەسەڵاتە نەبێتە زۆردار وە ئەوەی بێ دەسەڵاتیشە بێ ئومێد نەبێت لە وەرگرتنەوەی مافەکەی، ڕونکردنەوە لەو کەسە پێویستە کە شکات دەکات وە ئەوەشی نکۆڵی بکات دەبێت سوێندبدرێت.

سوڵح کردن کارێکی باشە بکرێ لەنێوان موسوڵماناندا، مەگەر سوڵحێک بێت حەرام حەلاڵ بکات و بەپێچەوانەشەوە.

ڕێت لێنەگیراوە لەوەی کە کێشەیەک بتەوێ قەزاوەتی لەسەر بدەی دوای بخەی بۆ کاتێک کە هۆشت و عەقڵت تەواو لەسەر خۆتە، چونکە گەڕانەوەی حەق بۆ خاوەن ماف کۆن نابێت و باشترە لەوەی کە باتڵ سەربکەوێ.

تێگەیشتن لە روداو کێشەکان ئەوەتان لە ناو دڵەکاندایە نەک لە قورئان و سونەت چونکە ئەو دوانە رۆشناین بۆت بەڵام تێگەیشتنی خۆت زۆر گرنگە لە روداوەکان.

پاشان بزانە گومان و نمونەکان کە دێنە بەردەستت بۆ دڵنیابونەوە زیاتر پشت بەوە ببەستە بزانە کامیان نزیکە لە حەقەکەی خوای گەورەوە ئەوەیان هەڵبژێرە، ئەگەر

کەسێک بانگەشەی حەقێکی نادیاری کرد یاخود بەڵگەیەکی ماوە دیاریکراوی کرد، بەڵگەی هێنا ئەوە حەقەکەی وەربگرە ئەگەر نا ئەوا بۆی ڕێگە پێدراوبکە، چونکە ئەمە زیاتر گومان ناهێڵێ، ئاگادارت دەکەمەوە لە سنگ تەسکی و بێ ئارامی و تورەبوون و ئازاردانی بەرامبەرەکەت، وە نەناسین لەکاتی رووبەڕوکردنەوە چونکە بڕیاردان لە شوێنی حەقدا خوای گەورە پاداشتی گەورە دەکات و سەرەنجامی پێ باش دەکات، هەرکەسێک نیەتی راستبێت و روو لەخۆی بکات ئەوا خوای گەورە بەسە بۆ نێوان خۆی و خەڵکی و نێوانیان باش دەکات، وە هەرکەسێک شتێک بۆ خەڵکی دەربڕێت کە خوا دەزانێت لەودانیە ئەوا خوای گەورە ناشرینی دەکات، ئیتر تۆ گومانت چۆنە بە پاداشتی خوای گەورە کە رزق و رۆزی بێ کۆتایە لە ئێستاو دوارۆژ، والسلام...

شەهیدکردنی عومەری کوڕی خەتاب لە کۆتای مانگی ذي الحجة ساڵی ٢٣ هیجری.

بوخاری بۆمان دەگێڕێتەوە لە عەمری کوڕی مەیمون و دەڵێ:

(( من لە ریزی نوێژدا وەستابووم لەنێوان من و عومەردا تەنها عبدالله کوڕی عەباس هەبوو ئەو بەیانیەی کەدرا لە عومەر، عومەر کاتێ تێدەپەڕی بەنێوان ریزەکانی نوێژدا ئەیوت: رێک بووەستن، کە بەرێکی وەستان چووە پێشەوەو الله ئەکبەری کرد، جا نازانم سورەتی یوسفی خوێند یان نەحل لە رکاتی یەکەمدا هەتاوەکو خەڵکی کۆبێتەوە، هەر کە الله ئەکبەری کرد یەکسەر گوێم لێ بوو وتی: کوشتمی ئەو سەگە، کاتێک لێیدا ئەو رەشتاڵە بێگانەیە بە چەقۆیەکی دووسەرەوە، پاشان بۆی دەرچوو بەلای هەرکەسدا تێدەپەڕی برینداری دەکرد، بەلای راست و چەپدا هەتاوەکو سیازدە کەسی بریندارکرد کە حەوتیان مردن، ئەوەبوو پیاوێک لە موسوڵمانان پاڵتۆیەکی گەورەی دا بەسەریدا کاتێک بکوژەکە زانی گیراوە چەقۆیەکیدا لەخۆی، عومەریش دەستی عەبدولرەحمانی کوڕی عەوفی گرت و خستیە پێشەوە بۆ بەرنوێژی، ئەوانەی لەدوای عومەرەوە بوون ئەو دیمەنەیان بینی بەڵام ئەوانەی دوربوون و دەنگی عومەریان نەبیست کە هاواری کردووە بۆیە ئاگاداری روداوەکە نەبون و نوێژی خۆیان بەردەوامکرد، عەبدول رەحمانیش نوێژێکی سوک و خێرای بۆکردن، کاتێک لێبۆوە عومەر وتی بە ئیبن و عەباس بزانە کێ لێیدام؟ ئەویش هەندێک گەڕاو پاشان هات و وتی: خزمەتکارەکەی موغەیرەبوو، عومەریش وتی مەبەستت ئەبو لوئلوئەی فەیروزە؟ وتی: بەڵێ، وتی خوا بیکوژێ خۆمن فەرمانمداوە کە باشبێ لەگەڵیدا، پاشان

عـومەر وتـی: سـوپاس بـۆ خـوا مەرگـم لەسـەر دەسـتی کەسـێک نەبـوو کە لافی موسـوڵمانێتی لێبدا، پاشـان رویکردە عەبدوالله وتی: تۆو باوکت مەبەستی عەباس بوو کە زۆر حەزتـان دەکـرد ئەم بێگانـانە زۆربـن لەمەدیـنەدا، عەبـاس لەهەمویـان زیـاتر کۆیلەی هەبـوو، عەبـدوالله وتی حەزدەکەیت دەریانـدەکەین، عـومەر وتی نـا ئەوانە لە داهـاتوو دەبـنە موسـوڵمان و نـوێژ دەکەن و حەج دەکەن، ئینجـا هەڵیـانگرت و بردیانەوە بۆماڵی خۆی ئێمەش لەگەڵیدا چووین، ئەت وت ئەو رۆژە خەڵکی نەهامەتی و ناخۆشـی وای بەسـەردا نەهـاتووە، ئینجـا هەنـدێک دۆشـاوی خورمایـان هێنـا و خـواردیەوە، بەڵام لەسکیەوە هاتەدەرەوە، پاشـان ماستیان بۆهێناو خـواردی بەڵام لە بـرینەکەیەوە هـاتەدەرەوە، ئیتـر دڵنیـابوین لە مردنـی، ئـێمە چـوینە ژوور بـۆلای و خەڵکیش هاتن و وەسفیان دەکرد.

پیـاوێکی گەنـج هـاتوو وتـی: مـوژدەم بـدەرێ ئەی ئەمیری بـاوەڕداران بەو مـوژدەیەی کە خـوای گەورە کردیتی بە هـاوەڵی پێغەمـبەر صَلَّى الله عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ و وە ئەوەی زانیـت لە ئیسـلامدا پێشکەشـتکرد، پاشـان کە بـویتە خەلـیفە داد پەروەریـت بەرپـاکرد، پاشـان شەهیدیشـت بە نسـیب بـوو، عـومەر وتـی: خـۆزگە ئەم قسـانەت دەبـڕیەوەو کۆتایـت پێدەهێنا.

کاتێـک گەنـجەکە ویسـتی بـڕوات جلەکانی لە زەوی دەخشـا و عـومەر بینی و وتـی: ئەی کـوڕی بـرام جلەکانـت بەرزبـکەرەوە، چـونکە رێـک و پێـک بـوونی جلەکانـت لە تەقـوای خـواوەیە، پاشـان وتـی: ئەی عەبـدوالله کـوڕی عـومەر بـزانە چەنـد قەرزاری خەڵکـیم؟ کاتێـک حسـاب کـراو ژمێرا نزیکی هەشـتاو شـەش هەزار بـوو، عـومەر وتی: ئەگەر پارەی

خێڵی عومەر بەشی نەکرد ئەوا داوا لە هۆزی عەدی کوڕی کەعب بکە، ئەگەر ئەوەش بەشی نەکرد داوا لە قورەیش بکە، بەڵام لەمان تێپەڕ مەکەو قەرزەکەم بۆ بژمێرە.

ئینجا بڕۆ بۆلای عائیشە دایکی ئیمانداران و پێی بڵێ: عومەر سەلامی لێ ئەکردی، نەڵێی ئەمیری باوەڕداران چونکە من ئەمڕۆ ئەمیرنیم، بڵێ عومەری کوڕی خەتاب دەیەوێ مۆڵەتت لێوەربگرێ کەلەگەڵ دوو هاوڕێکەیدا بنێژرێ، پاشان عبدالله رۆیشت و سڵاوی کرد و چووە ژورەوە بینی عائیشە دانیشتووە و ئەگری، وتی: عومەر سڵاوی بۆت هەیە و داوای مۆڵەتت لێدەکات بۆ ناشتنی لەپاڵ دوو هاوەڵەکەیدا، عائیشە وتی: بۆ خۆمم دانابوو، بەڵام ئەمڕۆ ئەو پێش خۆم دەخەم.

کاتێک گەڕایەوە وتیان عەبدوالله کوڕت هاتەوە، عومەریش فەرموی بەرزم بکەنەوە پیاوێک چووە ژێر باڵی، عومەر وتی: چیتکرد؟ عەبدوالله وتی ئەوەی تۆ پێتخۆشبوو مۆڵەتی دا، ئەویش وتی: سوپاس بۆخوا، هیچ شتێک لەلام لەوە گرنگتر نەبوو.

جا ئەگەر گیانم کێشرا هەڵم گرن و بمبەن و سڵاو بکەن و بڵێ: عومەری کوڕی خەتاب داوای مۆڵەت دەکات جا ئەگەر مۆڵەتیدا بمبەنە ژورەوە ئەگەر رازیش نەبوو بمبەنەوە بۆ گۆڕستانی موسوڵمانان.

پاشان عائیشە مۆڵەتی داو لەتەنیشت دوو هاوەڵەکەیدا نێژرا.

عەمری کوڕی مەیمون بەردەوام دەبێت لە گێڕانەوەکاندا و دەڵێ: پێش ناشتنی عومەر حەفصەی دایکی ئیمانداران لەگەڵ ژنانی تردا هاتن، کاتێک بینیمانن هەستاین و ئەوانیش هاتنە ژورێ، ماوەیەکی زۆر مانەوەو دەگریان بەبەردەوامی، پاشان پیاوان

داوایان کرد بێنه ژورێ، کاتێک هاتن گوێمان له گریانیان بوو دەیان وت: ئەی ئەمیری باوەڕداران وەسیەتمان بۆ بکە لەدوای خۆت کێبێتە خەلیفە.

عومەر وتی: کام لەمانە شایەنی ئەوەن کە ببنەوە بە جێگرەوەی من، هەروەک چۆن ئێمە بوینەوە بە جێگرەوەی پێغەمبەر (صَلَّى الله عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)، کام لەمانەی ناویان دەهێنم ئێوە پێی رازین، عەلی و عوسمان و زوبێرو تەلحەو سەعد و عەبدولرەحمانی کوڕی عەوف، وە عەبدواللە کوڕیشم شاهید دەبێت لەم هەڵبژاردنەدا بەڵام ئەو نابێتە پاڵێوەر بۆ ئەو کارە.

پاشان عومەر ئامۆژگاری و وەسیەتی کرد بۆ موهاجیرەکان و وە وتی ئەوانە ئەهلی خێرن و رێزیان لێبگرن، وە ئامۆژگاری و وەسیەتیشی کرد بۆ ئەنصارەکان و داوای کرد کە ئەوانە ئەهلی خێرن و خوای گەورە بە دارولئیمان ناوی هێناون و رێزیان لێبگرن.

پاشان وەسیەتییکرد بۆ هەموو ناوچەکانی تری ئیسلام و داوای لێکردن کە دەست بە ئیسلامەوە بگرن و بە توندی دژی دوژمنان بوەستنەوە، پاشان وەسیەتیکرد بۆ عەرەبەکانیش و پێی وتن کە ئێوە نزیکترین خەڵکن لە ئیسلام، پاشان ئامۆژگاری ئەوانەی دەوروپشتی خۆیکردو داوای لێکردن کە چاودێری هەژاران و کەم دەستەکان بکەن و گرنگیان پێبدەن، پاشان ئەوانەی هاتونەتە ژێر زیمەتی خواو پێغەمبەرەکەی بیان پارێزن و ئاگاتان لێیان بێت، کەسێکیش کە لەتوانایدا نەبوو مەیان بەن بۆ جەنگ، پاشان وەفاتی کردو هەڵمان گرت و بردمان بۆ ماڵی عائیشە و عەبدواللە کوڕی داوای ئیزنی چونە ژورەوەی کرد لە عائیشەو ئەویش مۆڵەتی داو وتی: فەرموو وەرنە ژوور، پاشان ناشتمان و کە تەواوبوین کۆمەڵی ئەوانەی کە دەبوو یەکێکیان دابنرێن

بۆ جێگرەوەی عومەر کۆبونەوە، عەبدورەحمانی کوڕی عەوف وتی: ئەم جێگرەوەیە با سێ کەس بمێنێتەوە لێی هەتا جیاوازیەکان کەم بێتەوە.

زوبێری کوڕی عەوام وتی: من دەکشێمەوەو دەیدەمە عەلی.

طەلحە وتی: منیش دەکشێمەوەو دەیدەم بە عوسمان.

سەعدیش وتی: منیش دەکشێمەوەو دەیدەم بە عەبدول ڕەحمان کوڕی عەوف.

عەبدول ڕەحمانیش وتی: منیش لێی دەردەچم و ڕویکردە عوسمان و عەلی و وتی: کامتان وازی لێدێنن بۆ ئەوی ترتان، سوێند بەخوا هەردوکتان لە ئیسلامدا خاوەن و گەورەی و ڕێزن، هەردوکیان بێدەنگ بوون و وەڵامیان نەدایەوە.

عەبدول ڕەحمان وتی: ئایە ڕازین من یەکلای بکەمەوە؟ سوێند بەخوا فەزڵی هیچتان بەسەر ئەویترتاندا نیە، لای من هەردوکتان کەسی شیاوو گونجاون بۆ ئەم کارە.

هەردوکیان وەڵامیان دایەوەو وتیان: بەڵێ ڕازین.

دەستی عەلی کوڕی ئەبوتالیبی گرتوو وتی: تۆ لە نزیکەکانی پێغەمبەری (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وە لەو کەسانەیی کە لە سەرەتادا موسوڵمان بوی، ئەگەر تۆمان دیاری کرد بە داد پەروەری حوکم بکە، وە ئەگەر عوسمانیش دیاری کرا ئەوا گوێڕایەڵی بکە، پاشان دەستی بەرداو دەستی عوسمانی گرت و هەمان شتی بۆ دوبارە کردەوە، لەدوای ئەوەی کە بەڵێنی لە هەردوکیان وەرگرت وتی: دەست بەرزبکەرەوە عوسمان، بەیعەتی دا بە عوسمان و پاشان عەلیش بەیعەتی پێداو وە ئەوانەی لەو دانیشتنەشدا بوون بەهەمان شێوە بەیعەتیان پێدا.

لە ریوایەتێکیتردا هاتووە کە عەبدول رەحمانی کوڕی عەوف بۆ ماوەی سێ شەو بەناو مەدینەدا گەڕاوە بۆ ئەوەی بۆچونی خەڵکی مەدینە وەربگرێ دەربارەی ئەو کەسانەی کە هەڵبژێراون بۆ ئەم کارە، زۆربەی خەڵکەکە پێیان باش بووە کە عوسمان ببێتە خەلیفەی باوەڕداران.

## خەلافەتی عوسمانی کوڕی عەفان

## لە مانگی "ذي الحجة" ی ساڵی ٢٣ هیجری بۆ مانگی " ذي الحجة"ی ساڵی ٣٥ هیجری

**سەرەتایەک بۆ ناسینی:**

❖ عوسمانی کوڕی عەفان نازناوی "ذي النورين" واتە خاوەن دوو نورەکەی لێنراوە، هۆکاری ئەم نازناوەش بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە دوو کچی پێغەمبەر (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)ی خواستووە، بەناوەکانی (روقیە و ئوم کەلسوم) کە روقیە لە رۆژی سەرکەوتنی بەدردا وەفات دەکات، وە ئوم کەلسوم لە ساڵی ٩ هیجریدا وەفات دەکات.

❖ بوخاری لە کتێبە سەحیحەکەیدا بۆمان دەگێڕێتەوە لە ئەنەسەوە و دەڵێ: پێغەمبەر صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لەگەڵ ئەبوبەکرو عومەر و عوسمان چووە سەر کێوی ئوحد و کێوەکە کەوتە لەرزین و بومەلەرزە رپودا، پێغەمبەر صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فەرمووی "ئارامبگرە ئەی ئوحود قاچی کێشا بە زەویەکەداو وتی: تۆ ئێستا پێغەمبەرێک و صدیقێک و دوو شەهیدتت لەلایە".

❖ بوخاری بەهەمان شێوە بۆمان دەگێڕێتەوە ئەمجارە لە ئەبو موسای ئەشعەریەوە دەفەرموێ:(پێغەمبەر صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) چووە ناو خێمەیەکەوە و بەمنی وت لەبەردەرگای خێمەکە بمێنەوەو ئاگاداربە، پیاوێک هات و داوای کرد رێی پێبدەم بچێتە ژوورەوە، پێغەمبەر فەرمووی بابێتە ژورەوەو موژدەی بەهەشتی پێبدە، ئەو کەسەش ئەبوبەکربوو، پاشان کەسێکی تر هات بەهەمان شێوە داوای کرد بچێتە ژوورەوەو پێغەمبەریش رێی پێداو فەرمووی: بابێتە ژوورەوەو موژدەی بەهەشتی پێبدە، ئەو کەسەش عومەربوو، پاشان کەسێکیتر هات و بەهەمان شێوە داوایکرد بچێتە

ژوورەوەو پێغەمبەریش کەمێک بێدەنگ بوو پاشان وتی بابێتە ژوورەوەو مـوژدەی بەهەشتی پێبدە لەسەر ئەو نارەحەتیەی تووشی دەبێت، ئەویش عوسمانی کوڕی عەفان بوو.

❖ موسلیم لە صەحیحەکەیدا بۆمان دەگێڕێتەوە لە عائیشەوە رەحمەتی خوای لێبێت و دەفەرموێ: پێغەمبەر صَلَّى الله عَلَيْهِ وَسَلَّمَ جارێک لەماڵەوە دانیشتبوو قاچەکانی راکێشابوو کەمێک هەستی بەهیلاکی دەکرد، ئەبوبەکر داوای ئیزنیکردوو هاتەژوور و دەستیانکرد بە قسەکردن، پاشان عومەر هات و داوای ئیزنیکرد و هاتە ژوور و دەستیانکرد بە قسەکردن، پاشان عوسمان هات و داوای ئیزنیکرد بێتەژوورەوە، پێغەمبەر صَلَّى الله عَلَيْهِ وَسَلَّمَ کاتێک زانیتی کە عوسمانە خـۆی رێکخستەوەو قاچەکانی کۆکردەوە، کاتێک هەموویان رۆیشتن، عائیشە بە پێغەمبەری فەرموو: ئەبوبەکر هات هیچت نەکرد پاشان عومەر هات بەهەمان شێوە هیچت نەکرد، بەڵام کە عوسمان هات خۆت رێکخستەوەو دانیشتی؟

پێغەمبەر فەرمووی: ((ئایە شەرم نەکەم لە پیاوێک کە فریشتەکان شەرمی لێدەکەن)).

عوسمانی کوڕی عەفان سەرەتای دەستپێکردنی بە چوونە سەر خەلافەت بە وتارێک دەستیپێکرد کە ئاراستەی موسوڵمانانیکرد، لەدوای سوپاس و ستایشکردنی خوای گەورە فەرمووی:

ئەی خەڵکینە یەکەمین دەسپێکردن قورسە، لەدوای ئەمڕۆش رۆژانیتر بەڕێوەیە، من نامەوێ وتارتان بۆبدەم چونکە وتارزانیم، ئەوەی دەیزانم خوای گەورە فێریکردووم، ئێوەش ئیمامێکی دادپەروەرتان دەوێ نەک ئیمامێکی قسەزان.

عوسمان چوار نامەی نووسی: یەکەم بۆ کاربەدەستەکان، دووەم بۆ ئەوانەی زەکات کۆدەکەنەوە، سێیەم بۆ خەڵکەکە، چوارەم بۆ سەرکردەکانی سوپا، بەم نامانە عوسمان سیاسەتی ناوخۆی دارشت کەلەسەر هەمان مەنهەجی پێغەمبەر صَلَّى اللّٰه عَلَيْهِ وَسَلَّمَ دەڕۆیشت، ئەویش بۆ بەدەستهێنانی دادپەروەری و یەکسانی.

عوسمان وەک عومەر نەبوو لە رەفتارو هەڵسوکەوتیدا، چونکە عومەر توند و رەق بوو، ئەمەش شتێکی ئاساییە چونکە هەر کەسەو تایبەتمەندی کەسایەتی خۆی هەیە، جارێکیان خواردنێکیان پێشکەشی عوسمان کرد کە پارچەیەکی بچووک لە گۆشتی بەرخی ناسک بوو، لەگەڵ ئاردی سپیدا، خەڵکەکە کەوتنە قسەکردن و وتیان کە عومەر گۆشتی پیری دەخوارد نەک ناسک، عوسمانیش فەرمووی: رەحمەتی خوای گەورە لە عومەر بێت جا کێ ئەتوانێ وەک عومەر بێت.

لەسەردەمی عوسماندا حاڵ و گوزەرانی خەڵک بەرەو باشی و خۆشگوزەرانی دەچوو، ئەمەش شتێکی ئاساییە چونکە لەو سەردەمەدا خێرو بەرەکەت دەباری بەسەر ئوممەتی ئیسلامدا بەهۆی زۆری دەستکەوتی جەنگ لە فەیئوو غەنیمەت.

بوخاری بۆمان دەگێڕێتەوە و دەفەرموێ: حەسەن دەگێڕێتەوە و دەڵێ: عوسمان دەیویست ئەو نیعمەتانەی کەهەن بگات بە خەڵکەکە، هەربۆیە دەیووت ئەمڕۆ هیچ کەسێک نابێت بمێنێ کە ئەم خێرو بەرەکەتەی پێنەگات، دەیووت پێمان: ئەی کۆمەڵی موسوڵمانان بڕۆن بەشی خۆتان وەربگرن، ئێمەش دەچووین و وەرماندەگرت، پاشان دەیووت پێمان: بڕۆن کەل و پەلەکانتان وەربگرن ئێمەش دەچووین، پاشان دەیووت: بڕۆن رۆن و هەنگوین و چەندین شتیتر کە هەبوون دەیبەخشیە خەڵکەکە، ئێمەش

وەرمانـدەگرت، هـیچ موسـوڵمانیک نەبـوو لەو سـەردەمەی عوسـماندا بترسێ لە موسـوڵمانێکیتر، هەرکـات بەیەکتـری گەیشـتنایە وەک بـرا دەبـوون لەگەڵ یەکـدا، لەسـەردەمی عوسـماندا ئامۆژگاری و خۆشەویسـتی و رێزگـرتن بـاڵی کێشـابوو بەسـەر خەڵکەکەدا.

کاتێک کە فارسـەکان و رۆمەکان بە کوژرانی عومەریـان زانی کەوتنە خۆیـان، هەتـا ئەو ناوچـانەی فـارس کە پەیمـان نـامە لەنێوانیانـدا هەبـوو لەگەڵ موسـوڵمانان کەوتـنە هەڵوەشـاندنەوی، هەروەهـا رۆمەکانیش کەوتنە یاخیبوون و هێرشـیان کـرد بۆ شـام و هەروەهـا بـۆ میصـریش بەهەمـان شـێوە، عوسـمان لێرەدا کەوتە تـاقیکردنەوەیەکی گەورەوە هەروەک چـۆن ئەبـوبەکر لەسـەر دەمی جەنگی هەڵگەڕاوەکانـدا تێـیکەوت، بەڵام موسـوڵمانان توانیـان بەرەنگاریـان بـبەنەوەو دەرسـێکی وایـان دابـدەن کەقەت بیریـان نەچێـتەوە، وە توانیشـیان ئەو ناوچـانەی فـارس کـۆنترۆڵ بـکەنەوە، لەگەڵ ئەوەشـدا کە کردیـان خەڵـکەکە، بەڵام موسـوڵمانان داوای لێبوردنیـان لێـوەرگرتن، لەگەڵیشـاندا ژیـان لەژێـر چەتـری ئیسـلامدا زۆر بە ئەمـان و دڵخۆشـیەوە، بەهەمـان شـێوەش توانیـان شکسـت بە رۆمەکان بهێـنن و ئەو هێرشـەی کردیـان بـۆ شـام لەنـاوی بەرن.

## دروستکردنی یەکەمین کەشتی ئیسلامی دەریای لە ساڵی ٢٨ هیجریدا:

موعـاویەی کـوڕی ئەبـو سـوفیان کە والی شـام بـوو تـوانی یەکەمـین کەشـتی دەریـای دروستبکات لە مێژووی موسوڵماناندا، پێشتریش موعاویە فیکرەکەی دابوو بە عـومەر کە شـتێکی وادروسـتبکەین، بەڵام عـومەر رازی نەبـوو بە دروسـتکردنی لەترسـی روحی موسـوڵمانان، پاشـان فیکـرەکەی پێشـکەش بە عوسـمان کـرد ئەویـش قبـوڵیکرد، موعـاویە تـوانی بەئـاودا بپەڕێـتەوەو قبـروص ئـازاد بکـات، جـزیەش لە خەڵـکەکەی وەربگرێت، لەگەڵ خۆشیدا ئوم حەرام کە ژنی "عیبادەی کوڕی صامت"بوو پەڕیەوە و چوو لەگەڵیدا، ئەمەش موعجیزەی پێغەمبەر صَلَّى اللہ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ پشتڕاستدەکاتەوە کە فەرمووی بە ئوم حەرام تۆ یەکەمین کەس دەبی کە لە دەریا دەپەڕێیتەوەو لەوێش دەمری.

### ئازادکردنی قبروص:

بوخاری لە صەحیحەکەیدا لە بەشی جیهاد لە بابەتی (الإمارة) دا دەگێڕێتەوە: ((ئەنەس دەڵێـت: پێغەمـبەر صَلَّى اللہ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ خەوێکی کـورت خەوت و خەبەری بـۆوە بەڵام زەردەخەنە لەسـەر لێـوی بـوو کاتێـک بەخەبەر هـاتەوە، ئـوم حەرام پرسـیاری لێکـرد دەربارەی پێکەنینەکەی، پێغەمبەر فەرمووی: بینیم خەڵکانێک لە ئوممەتەکەم دەچن بـۆ جیهـاد لە پێنـاوی خـوای گەورە لەسـەر کەشـتی دەریـای، پاشـان چـاوی نوقانـدو کەمێکیتر خەوی لـێکەوتەوە بـۆ جـاری دووەم، پاشـان هەسـتایەوە و هەمـان خەوی پێشـووی بینی و گێڕایەوە، ئـوم حـرام وتـی: ئەی پێغەمـبەری خـوا دۆعـام بـۆ بـکە مـن لەگەڵ ئەواندابم، پێغەمبەر فەرمووی: بەڵێ تۆ لەگەڵیاندایت)).

یەکەمین سوپا کە جەنگی دەریایکرد سوپاکەی موعاویە بوو کە قبروصی ئازاد کرد لە ساڵی ٢٧ هیجریدا، لەسەردەمی خەلافەتی عوسمانی کوڕی عەفان، وە لەگەڵیشیدا ئوم حرام هەبوو کە خێزانی "عیبادەی کوڕی صامت"بوو، ئوم حەرام مرد لەپێناوی خوای گەورە لە قبروص وە هەتا ئێستاش قەبرەکەی لەوێیە، ئیبن و کەسیر دەڵێت: پاشان سەرکردەی سوپای دووەم یەزیدی کوڕی موعاویە بوو کە قوستەنتینیەی ئازادکرد، پاشان دەڵێت: ئەمەش گەورەترین دەلیلە بۆ پێغەمبەرایەتی پێغەمبەر صَلَّى اللہ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ کە موژدەی هەردوکیانی پێشتر داوە...

**لە ساڵی ٣١ هیجریدا:** موسوڵمانان توانیان بە سەرکردایەتی "عبداللە کوڕی ئەبی صەرح" ناوچەی (النوبة) کە سۆدانی ئێستادەکات ئازاد بکەن، کە قورسترین ئازادکردن بوو رووبەڕویان بۆوە، چونکە دوژمنان رێگەیەکی جیاوازیان بەکاردەهێنا کە پێشتر موسوڵمانان ئاشنا نەبووبووپێ و راهێنانیان لەسەر نەکردبوو، ئەویش بریتیبوو لە هاویشتنی تیرەکان بۆ چاوی موسوڵمانان، کە لەو جەنگەدا نزیکی ١٥٠ موسوڵمان پێکران لەسەرەتای جەنگەکەدا.

عەبدوالله توانی جەنگەکە بوەستێنێ بە پێکهێنانی رێکەوتن نامەیەک لەگەڵیاندا کەناونرا (بالبقط) کە ماوەی ٦ سەدە بەردەوامی کێشا ئەم رێکەوتن نامەیە و ناوچەکانی (میصرو النوبة)ی گرتەوەو جەنگی لێوەستا بە تەواوی.

لەهەمان ساڵدا لە ٣١ هیجریدا رۆمەکان بڕیاریاندا کە کۆتای بە کەشتی گەلی ئیسلامی بێنن، کە موسوڵمانان توانیبویان لێوارەکانی دەریای ناوەڕاست کۆنترۆڵ بکەن، بەمەش کەشتیەکانی موسوڵمانان ببوونە مایەی هەڕەشە بۆ رۆمەکان، بۆیە

(قوسـطنطين كـوڕی هرقـل) بڕیاریـدا كه دەربچێـت به هەزار كەشـتیەوە بـۆ ئەوەی هێرشبكاتە سەر موسوڵمانان و كۆتاییان پێ بهێنێت.

موسـوڵمانانیش دەرچـوون به سـەركردایەتی (بوسـری كـوڕی ئەرطـائە) له كەشـتیەكانی شـام وه عەبدوالله كوڕی ئەبی صەرح له كەشتیەكانی میصرەوە، پاشـان هەرهەمویـان له ژێر سەركردایەتی بوسردا كۆبوونەوە كه ژمارەیان بووه دووسەد كەشتی.

شـوێنی جەنـگەكه له نـاوچەی (ذات الصـواري)بوو كه دەكەوێـته رۆژئـاوای شـاری ئەسكەندەریەوە له میصر، موسـوڵمانان هەوڵیـان ئەدا رۆمەكان ناچاربكەن كه بێـنه مەیدانی وشكانیەوە بۆ جەنگكردن.

بەڵام رۆمەكـان پێـداگریان دەكـرد لەسـەر ئەوەی كه جەنـگەكه له نـاو دەریـادا ئەنجامبـدرێت، خـوای گەورە كـردیه دڵی سـەركردایەتی موسـوڵمانانەوە كه هەوڵبـدات هەرچۆنێك بێت جەنگەكه له وشكانیدا بێت وەك لەوەی لەدەریادا ئەنجامبدرێت، بۆ ئەمەش عەبدوالله كوڕی ئەبی صەرح[1] فەرمانیكرد به سـەربازەكانی كه نزیـك ببنەوە له كەشتی دوژمنان، هەتا ئەوكاتەی كه كەشتی ئێمەو كەشتی ئەوان بەریەكتری دەكەون، پاشـان وتـی: یەكێـك لەخۆمـان بچێـته نـاو ئـاوەكەوە و هەردوو كەشـتیەكه به پەتێكی قـایم و پتەو پێكەوە ببەستێت، كەشتیەكان هەزارو دووسەد كەشتی دەبوون، هەموو

[1] عەبدوالله له فەتحی مەككەدا موسوڵمان بوو، بەڵام دواتر مورتەد بۆوە، بەڵام پاشـان موسـوڵمان بۆوە، وه دۆعای دەكرد و دەیفەرموو: خوایه كۆتا كارم له ژیاندا نوێژكردن بێت، نوێژی بەیانیكرد له كۆتـای تەمەنیـدا و پاشـان وەفـاتیكرد، عوسـمانی كـوڕی عەفـان بـووە هاوكاری كه تەوبەیكـرد و پشتیوانی كرد.

ده کەشتیەک یان بیست کەشتیەک پێکەوە دەبەستران وەک ئەوەی لێئەهات کە پارچە زەویەکەو لەسەر ئاوەکەیە.

موسوڵمانان وەک پیشەی هەموو جارێکیان بە هەڵمەتێکی بەهێزو پتەوەوە بەرەنگاری دوژمنان بوونەوە، تەبەری دەربارەی ئەم جەنگە دەڵێت: (خوێن سەری ئاوەکەی داپۆشیبوو، ئەوەندە جەنگەکە بەهێزبووە)

بەڵام لەکۆتایدا خوای گەورە سەرکەوتنی بەخشیە سەربازانی خۆی و قوسطنطین هەڵهات، پاشان موسوڵمانان توانیان دەست بەسەر دەریای سپی ناوەڕاستدا بگرن کە بەدەست رۆمەکانەوە بوو.

**لە ساڵی ٣٣ هیجریدا بۆ جاری دووەم قورئان کۆکرایەوە:**

بوخاری بۆمان دەگێڕێتەوە لە ئیبن شەهابەوە، کە ئەنەسی کوڕی مالیک دەڵێت: (حوزەیفەی کوڕی یەمان چووە لای عوسمانی کوڕی عەفان، پێشتر حوزەیفە بەشداری جەنگەکانی ئازادکردنی ئەرمینیای کردبوو لەگەڵ خەڵکی شام وە ئازادکردنی ئازەربایجان لەگەڵ خەڵکی عێراق، حوزەیفە هەستی بەوە کردبوو کە جیاوازی دروستبووە لە خوێندنەوەی قورئاندا).

حوزەیفە بە عوسمانی فەرموو: ئەی ئەمیری باوەڕداران، واهەستدەکەم ئەم ئوممەتەش جیاوازیان لە کتێبەکەیاندا بۆ دروست دەبێت هەروەک چۆن یەهود و نەصار تیایاندا پەیدابوو.

عوسمان ناردی بە شوێن حەفصەدا کە کچی عومەری کوڕی خەتاب بوو وە هاوسەری پێغەمبەریش بوو، داوای لێکرد کە ئەو نوسخە کتێبەی قورئان لایەتی بینێرێ بۆی، ئەویش ناردی بۆ عوسمان، پاشان عوسمان فەرمانیکرد بە (زەیدی کوڕی سابت و عەبدوالله کوڕی زوبێرو سەعیدی کوڕی عاص و عەبدول ڕەحمانی کوڕی هشام) کە سەرو نوسخەیەک لەو قورئانە بنوسنەوە.

عوسمان بە کۆمەڵە قورەیشەکەی وت کە لە سێ کەس پێکهاتبوون: ئەگەر جیاوازیتان تێدا دروستبوو لە نوسینەوەی قورئان لەگەڵ زەیدی کوڕی سابت، ئەوا بگەڕێنەوە بۆ زمانی قورەیش چونکە قورئان بە زمانی قورەیش دابەزیوە، دەستیانکرد بە نوسینەوەی قورئان هەتا هەریەکەو نوسخەی نوسیەوە، پاشان عوسمان نوسخەکەی حەفصەی ناردەوە بۆی، ئەوەشی کە نوسرایەوە ناردی بۆ هەموو ناوچەکان و بڵاویکردەوە، هەرچی نوسخەیەکیتریش کە نوسرابێت یان هەر لاپەڕەیەک کە نوسرابێت فەرمانیکرد کە بسوتێنرێت و لەناو ببرێت، تەنها ئەو نوسخانە بمێنێتەوە کە بڵاویکردەوە بە ناوچەکاندا).

لەم ریوایەتەوە بۆمان دەردەکەوێت کە ئەم کۆکردنەوەیە لەبەر چەند هۆکارێک بووە:-

❖ فراوان بوونی ناوچە ئازادکراوەکان و موسوڵمان بوونی ژمارەیەکی زۆر لە عەجەم[١] ، وە عومەری کوڕی خەتاب ڕێگەی نەئەدا کە هاوەڵانی پێغەمبەر صَلَّى اللّٰه عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ناوچەی مەککەو مەدینە بەجێ بهێڵن و دەیویست بەردەوام لەدەوری بن

---

[١] وشەی عەجەم مەبەست لەو خەڵکانەیە کە بە زمانی بێجگەلە عەرەبی قسەدەکەن و عەرەب نین.

بۆ راوێژکردن، بەمەش جیاوازی لە خوێندنەوەی قورئاندا دروستدەبوو، کە لەکۆتایدا فیتنەی لێ پەیدا دەبێت.

❖ عوسمان دەیویست قورئان لەسەر یەک پیت لە حەوت پیتەکە (واتە حەوت لەهجەکە)بنوسرێتەوە، ئەویش زمانی قورەیشە کە قورئان بەو پیتە دابەزیووە، وە رێگەشی بەوە ئەدا بە شێوەیەکی کاتی بە لەهجەکانیتر بخوێنرێتەوە هەتا زمانیان بە لەهجەی قورەیش ڕادێت.

هێنانەوەی نموونەیەک لەم ڕووەوە:

ئەو لیژنەیەی کە عوسمان دایනابوو بۆ نوسینەوەی قورئان جیاوازیان تێدا دروستبوو لەسەر نوسینەوەی وشەی "التابوت" کە لە قورئاندا هاتووە لە ئایەتی ٢٤٨ البقرة خوای گەورە دەفەرموێت(وقال لهم نبيهم إن اية ملكه أن يأتيكم التابوت فيه سكينة من ربكم وبقية مما ترك ال موسى وال هارون تحمله الملائكة إن في ذلك لأية لكم إن كنتم مؤمنين)

زەید وتی: ئاوا دەنوسرێت (التابوه)، بەڵام قورەیشیەکان وتیان ئاوا دەنوسرێت (التابوت)، جیاوازیەکەیان بەرزکردەوە بۆ عوسمان و ئەویش وتی: بنوسن (التابوت) لەبەرئەوەی قورئان بە زمانی قورەیش دابەزیووە، ئەمەی عوسمان کردی بۆ خزمەتی قورئان باشترین کاربوو، وە هەموو هاوەڵانی پێغەمبەریش صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ رازیبوون بەم کارەو بەباشیان زانی.

عەلی کوڕی ئەبوتاڵیب دەفەرموێ: (ئەی کۆمەڵی خەڵکی لە خوا بترسن دەربارەی عوسمان، زیادەڕەوی مەکەن لە قسەکردنتاندا دەربارەی سوتانی ئەو پەڕانەی قورئان

كە فەرمـانیكرد بیســوتێنن، ســوێند بەخـوا نەیدەســوتان ئەگەر هەمـوو هـاوەڵانی پێغەمبەرصَلَّى اللّٰه عَلَيْهِ وَسَلَّمَ هاوڕای نەبونایە لەو كارە)

ئەم كـارەش بـووە هـۆی داخسـتنی دەرگـایەكی فیتـنە كە خەریكبـوو روی لە ئـوممەتی ئیسـلامی دەكـرد، وە ئەگەر ئەم كـارەی عوسـمانیش نەبـوایە ئەوا هەتـا ئێسـتاش ئەو فیتنەیە بەردەوام دەبوو...

سەرهەڵدانی سەرەتاکانی فیتنە لە ساڵی ٣٤ هیجریدا:

**شوێن پەنجەی یەهود:**

عەبدوالله کوڕی سەبەء کە جولەکەیەکی یەمەنی بوو ناسراو بوو بە (ئیبن سەوداء) ئەو بووە هۆی داگیرسانی ئەو فیتنەیە لەو سەردەمەدا، لەدوای ئەوەی کە موسوڵمان بوو وە خۆشی وەک زانایەک دەردەخست، کەوتە گەڕان بەناو خەڵکە ئەعرابیەکان و گوند نشینەکان و توانی کاریگەری لەسەریان هەبێت، ئەویش بە هەڵبەستنی کۆمەڵێ قسەو قسەڵۆک و بڵاوکردنەوەی بەناو خەڵکیدا لەناوچە جیاجیاکاندا.

بە کابرایەکی وت: ئایە جێگیربووە یان بەڵگەهەیە کە عیسای کوڕی مەریەم بگەڕێتەوە بۆ دونیا؟

کابرا وتی: بەڵێ، عەبدوالله کوڕی سەبەئیش پێی وت: دەی خۆ پێغەمبەری خوا شایەنترە لەو بگەڕێتەوە بۆ دونیا، چونکە ئەو لە عیسا بەڕێزترو گەورەترە، پاشان لە قسەکردن بەردەوام بوو وتی: عەلی کوڕی ئەبوتاڵیب جێگرەوەیە، چونکە پێغەمبەر کۆتا پێغەمبەرە لەسەر زەوی وە عەلیش کۆتا جێگرەوەیە، پاشان وتی: کەوایە عەلی شایەنترە بە خەلافەت وەک لە عوسمان.

لەگەڕانەکانیدا چووە میصرو لەوێ کەوتە دروستکردنی فیتنەو ئاشوب لەو ناوچانەدا، پاشان نامەی نادر بۆ خەڵکی ساویلکەی کوفەو بەصرە، ئەم قسەو باسانەی لەناودا بڵاودەکردنەوە و ئەوانیش نامەیان بۆ دەناردنەوە و کاروباریان ڕێکدەخست بۆ ئەوەی کێشە بۆکاربەدەستەکانی شارەکان دروستبکەن.

خەڵکی فێردەکرد کە قسەو قسەڵۆک بڵێن بە عوسمان، وە هەروەها بەوە عوسمانی تاوانباردەکرد کە کەسە نزیکەکانی خۆی کردووە بە کاربەدەستی شارەکان یان چووە قورئانی سوتانووە، یەکێکی تر لەو گومانانەی کە بڵاویکردەوە و وە لەلایەن کەسانی زاناو بۆخواسوڵحاوەوە بەرپەرچدرایەوە ئەوەبوو کە بوخاری بۆمان دەگێڕێتەوە لە عوسمانی کوڕی موهب و دەڵێ: (پیاوێک لە خەڵکی میصر هات بۆ حەجکردن، بینی خەڵکانێک دانیشتوون لە شوێنێک، پرسی ئەوانە کێن؟، وتیان ئەوانە قورەیشین، کابرا وتی: کام لەئێوە گەورەکەتانە یان زانا کەتانە؟ وتیان: عەبدواللە کوڕی عومەر، کابرا وتی: ئەی کوڕی عومەر من پرسیارت لێدەکەم دەربارەی شتێک تۆش وەڵامم بدەرەوە، ئایە دەزانی کە عوسمان لە رۆژی ئوحدا هەڵهات؟وتی: بەڵێ دەزانم.

پاشان وتی: دەزانی کە لە جەنگی بەدردا بەشداری نەکرد؟ وتی: بەڵێ دەزانم، کابرا وتی: ئەی دەزانی لە بەیعەتی رضوان دا بەشداری نەکرد، ئیبن و عومەر وتی: بەڵێ دەزانم.

کابرا لە خۆشیدا وتی: الله أكبر.

ئیبن و عومەر وتی: وەرە با بۆت رونبکەمەوە، بە نیسبەت هەڵهاتنی لە جەنگی ئوحدا ئەوا خوای گەورە بە دەقی قورئان لێی خۆش بووە، وە بە نیسبەت جەنگی بەدریشەوە کچی پێغەمبەر صَلَّى الله عَلَيْهِ وَسَلَّمَ کە هاوسەری بوو (روقیە) زۆر نەخۆش بوو وە پێغەمبەر خۆی فەرمووی کە نەیەت بۆ جەنگ و ئاگای لە خێزانی بێت هەمان پاداشتی ئەو کەسەی دەبێت کە بەشداری جەنگی کردووە، وە بەنیسبەت بەیعەتی رضوانەوە عوسمان ئەو کەسە بوو کە پێغەمبەر صَلَّى الله عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ناردی وەک نوێنەر بۆ لای قورەیشیەکان لە مەککە، وە هەروەها لە ساتی بەیعەتەکەدا پێغەمبەر بۆخۆی دەستی

راستی بەرزکردەوە و فەرمووی ئەمە دەستی عوسمانەو بەیعەتیدا، پاشان ئیبن و عومەر بە کابرای وت ئێستا برۆ ئەوەی پێویست بوو پێت وترا.

لەپاش ئەم فیتنەبازیەی کە ئیبن سەوداء و شوێنکەوتووەکانی دەیانکرد لەناو ناوچەکانی ژێردەستی موسوڵمانان، ئەم هەواڵ و باسانە دەگەیشتنەوە بە خەلیفەی موسوڵمانان عوسمانی کوڕی عەفان، عوسمان لە کاتی هاتنی حەجدا لە ساڵی ٣٤ هیجریدا هەموو ئەمیرو کاربەدەستەکانی کۆکردەوە و کەوتە راوێژکردن پێیان دەربارەی ئەو کۆمەڵە کەسەی کە خەریکی ئاژاوە نانەوەبوون، زۆرینەی کاربەدەستەکان لەسەر ئەوەبوون کە هەموویان دوربخرێنەوەو نەهێڵن تێکەڵاوی موسوڵمانان بکەن، بەڵام عوسمان بۆچوونی پێچەوانەی ئەوان بوو پێی وابوو دەبێت بەنەرمی لەگەڵیاندا رەفتاربکرێت، بەڵام ئەم نەرم و نیانیەی عوسمان چارەسەری کێشەکەی نەکردوو بەردەوام بوون لە ئاژاوەو فیتنەبازیان.

لە ساڵی ٣٥ هیجریدا وەفدێک لەو کۆمەڵە ئاژاوەگێڕانە لە میصرەوە دێن بۆ مەککە بە بیانوی عومرە کردنەوە، بەڵام کە دەگەنە ئەوێ دەستدەکەن بە گفتوگۆکردن دەربارەی خەلیفەو بڵاوکردنەوەی گومان و تانەو تەشەر لە عوسمان و پاشان دەگەڕێنەوە ناوچەکانی خۆیان.

هەموو ئەو گومان و قسەو قسەڵۆکانەی دەربارەی عوسمان ئەوترا بێبەڵگەو بێنرخ بوون، هیچ وردەکاریەک و مەنتیقیەکی تێدانەبوو، وە لەگەڵ ئەمانەشدا هیچ ڕێزێکیان دانەئەنا بۆ خەلیفە، بەڵام عوسمان هەر بەدڵ نەرمی و بەسۆزەوە لەگەڵیاندا ئەجولایەوە، هەتا ئەو کاتەی کە پارچەیەکی بچوک گۆشتیان بۆ هێنا پێیان وت کە

عـومەر ئەو شـتانەی نەدەخـوارد، بۆ ئەوەی هـیچ کاردانەوەیەکی هەبێـت تەنها وتی کێ وەک عومەری پێدەکرێت.

ئەگەر وردبیـنەوە لەو ریـوایەتەی کە بوخـاری لە صـەحیحەکەیدا بۆمـان دەگێڕێتەوە، ئەوا دەزانین کە چۆن قسەیان کردووە بەرامبەر عوسمان.

بوخـاری بە سـەنەدی عەبـدوالله کـوڕی عەدی کـوڕی خیـار بۆمـان دەگێڕێتەوە و دەڵێ: (مەسـروری کـوڕی مـوخرەم و عەبـدولرەحمانی کـوڕی ئەسـوەدی کـوڕی یەغـوس(کە ئەمانە لەو سەردەمەدا لە زانایان و فوقەهاکان بوون) وتیان: چی ڕێگرە لەوەی کەقسە لەگەڵ عوسمان بکرێت سەبارەت بە براکەی وەلید (کەناوی وەلیدی کوڕی عەقەبەیە [1] برای عوسـمانە لە دایکەوە و وە کراوەتە والی کوفە بە قسـەی عـومەر لەدوای ئەوەی کە سەعدی کوڕی ئەبی وەقاصی لابرد).

وتـی: چـاوەڕێی عوسـمانم کـرد هەتـا لە نـوێژ تەواو بـوو، پـێم وت: کە کـارم پێـتەوە و دەمەوێ ئامۆژگاریەکت بکەم، عوسمان وتی: پەنا ئەگرم بەخوا لێت، پاشـان ڕۆیشـت و کەسێکی ناردەوە بۆلای و وتی: ئامۆژگاریت چییە؟ وتی: پاک و بێگەردی بۆخـوای گەورە کە پێغەمبەر(صَلَّى الله عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ)ی بە حەق نـاردووە بۆمـان، وە قـورئانیشـی بۆمـان دابەزاندووە، وە تۆش وەڵامی خـواو پێغەمبەرت داوەتەوەو هیجرەتت لەگەڵ کـردووە،

[1] وەلیـدی کوڕی عەقەبە: یەکێکە لە هـاوەڵان، وە موجاهیـدێک بـوو کە بەشـداری جەنگی دەکـرد لەسـەردەمی ئەبوبەکرو عومەریشـدا، بەڵام ئەوەی لەسـەری ببووە گومان و قسـەڵۆکی ئەوەبوو کە خزمی عوسمان بووە وە قسەی ئەوەیان دەکرد لەسەری کە مەشروبی خواردۆتەوە

وە هاوەڵی بووی و هیدایەتت وەرگرتووە، زۆرینەی خەڵکی قسەلەسەر وەلید دەکەن بەهۆکاری ئەوەی کە جێبەجێکردنی سزای مەشروبخواردن لەسەری دواتخستووە.

عوسمان وتی: پێغەمبەرت بینیووە؟ وتی: نەخێر، بەڵام زانستەکەی بڵاوبۆتەوەو منیش پێم گەیشتووە.

عوسمان وتی: خوای گەورە پێغەمبەر(صَلَّى الله عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)ی بەحەق ناردووە، وەڵامی خواو پێغەمبەرەکەمان داوەتەو هیجرەتیشمان لەخزمەتیدا کردووە، وەک خۆت فەرمووت، وە هاوەڵیم کردووە و پاشان هی ئەبوبەکرو پاشان هی عومەریش و هەتا خۆم بومەتە خەلیفە، ئایە من حەقترنیم بۆ ئەم کارە کە باسی دەکەیت؟ وتی: بەڵێ راستە.

عوسمان وتی: ئەی بۆچی ئەم قسانەدەکەیت بەرامبەرم؟ وە بەنیسبەت ئەوەی وەلیدیشەوە ئەوەی حەق بێت بەرامبەری دەکەین ان شاء الله، پاشان عەلی بانگکردوو پێی وت: کە هەشتا جەلد بدات لە وەلید.

لەم ریوایەتەوە بۆمان دەردەکەوێت کە چۆن ئەو قسەوقسەڵۆکانەی فیتنەبازەکان بڵاویان کردبۆووە بەناو کۆمەڵگەدا کاریگەری ئەوەندە زۆربووە هەتا کەسانی خاون زانستیش پێوەی گیرۆدەبوون، هەموو ئەو قسانەشی کە بڵاودەکرانەوە قسەی بێبنەماو بێ ئەرزش بوون، هیچیان شتانێک نەبوون کە ئەوەندە گرینگ بووبێتن بۆ دین و کۆمەڵگە، بەڵام سەرکردەکانی ئەم فیتنەبازیە بەردەوام بوون هەتا خەڵکەکەیان ئاڕاستە دەکرد کە بەرەو مەدینە بچن و گلەی و قسەڵۆک بڵاوبکەنەوە بەناو خەڵکیدا لەسەر خەلیفەو ئەمیرەکان، هەموویان رێکەوتن لەسەر ئەوەی کە لە

وەرزی حەجدا بەکۆمەڵ بچن بۆ حەج وە مەبەستی فیتنەبازیەکەشیان ئەنجامبدەن هەتا کارەکە بەئەنجام بێت، لە ساڵی ٣٥ هیجریدا کۆمەڵیکی زۆر لەو خەڵکانە کە نزیکی هەزار کەس دەبوون هاتن بۆ حەج کردن بەڵام دابەش بووبوون بەچەند کۆمەڵێکدا.

کۆمەڵەی خەڵکی میصر کەلەگەڵیاندا غافقی کوڕی حەرب و عەبدوالله کوڕی سەبەء هەبوون.

کۆمەڵەی خەڵکی کوفەو لەگەڵیاندا عەمری کوڕی ئەصەم و زەیدی کوڕی صوجانی عەبدی.

کۆمەڵەی خەڵکی بەصرە لەگەڵیاندا حەرقوصی کوڕی زەهیری سەعدی و حەکیمی کوڕی جەبلەی عەبدی.

بەرەنگاری عوسمان بوونەوە لە مەوسمی حەجدا، بە بڵاوکردنەوەی کۆمەڵێ قسەی هیچ و بێ ئەرزش، دەستیانکرد بە گردبونەوەو هەراو باس و ئاژاوە لەناو مەدینە، هاوەڵان خۆیان لێ بەدور ئەگرتن، هەرئاوا بەو کۆمەڵیەو باس و خواسانەوە گەڕانەوە ناوچەکانی خۆیان، هاوەڵان واگومانیان برد کە فیتنەکە کۆتای پێهاتووە.

جارێکیتر هاتنەوەو دەوری ماڵی عوسمانی کوڕی عەفانیاندا، عەلی کوڕی ئەبوتاڵیب پرسیاری لێکردن هۆکاری گەڕانەوەتان چیە؟ وتیان: خەلیفە نامەی ناردووە هەتا کۆمەڵێکمان بکوژن!!؟

عەلی وتی: ئەوە خەڵکی میصر بۆ ئەوە هاتوون ئەی خەڵکی کوفەو بەصرە ئێوە بۆچی هاتوون؟

وتیان: هاتوین نەهێڵین براکانمان بکوژرێن و پشتیان بگرین، عەلی پێی وتن: ئەی باشە ئێوە چۆن ئەم هەواڵەتان زانیوە؟ دیارە ئێوە پلان و بەرنامەتان پێکەوە هەیە؟ ئەم هۆکارانەن ئێوەی هێناوەتە مەدینە.

وە دەریش کەوت ئەو نامانەی کە نێردرابوون بەناوی ئیمامی عەلیەوە درۆ بوو، هەروەها ئەو نامانەی کە نێردرابوون بەناوی تەڵحەو زوبێرەوە بۆ خەڵکی کوفەو بەصرە ئەوانەش هەمووی نامەی تەزویربوون و ئاشکراکران، بۆیە خەڵکی مەدینە رێیان لێگرتن کە بچنە ناو مەدینەوە.

بەڵام ئەم رێگریە بەری پێنەگیراو کۆمەڵێک هەر چونە ناو مەدینەو دەوری ماڵی عوسمانی کوڕی عەفانیاندا و تەنگیان پێهەڵچنی، کۆمەڵێک لە نەوەکانی هاوەڵان چونە دەوری ماڵی عوسمان بۆ بەرگریکردن لێی و پاراستنی وەک (حەسەن و حوسێین و عەبدوڵلە کوڕی زوبێر و عەبدوڵلە کوڕی عومەر) و زۆریتر لە سوارچاکەکان ئامادەبوون لەوێ کە ئەو گەمارۆیە بشکێنن.

ئاژاوەگێڕەکان گەمارۆی ماڵی عوسمانیان بە شێوەیەک دابوو کە نەیان دەهێشت ئاویان پێبگات، عەبدوڵلە کوڕی عومەر چووە ماڵەکەوە بۆلای عوسمان کە شمشێرەکەی ئامادەکردبوو بۆ جەنگ، عوسمان پێی وت: ببینە ئەو خەڵکە چی دەڵێن، دەڵێن: یان دەبێت واز لە خەلافەت بێنیت یان دەتکوژین، ئیبن و عومەر پێی وت: ئایە دەتوانی بۆ هەتایە لەدونیادا بمێنیتەوە؟ وتی: نەخێر، پاشان وتی: مردنی تۆ بەدەست ئەوانە؟ عوسمانی وتی: نەخێر، عەبدوڵلە وتی: ئایە بەهەشت و دۆزەخ بەدەست ئەوانە؟ وتی: نەخێر، عەبدوڵلە وتی: دەی کەواتە واز لە خەلافەت مەهێنە کە خوای

گەورە پێیداوی، هەر میللەتێک رقیان لە خەلیفەکەیان هەستا یان لای دەبەن یان دەیکوژن.

ئەبو هورەیرە چووە ماڵە کەی عوسمان پێی وت: ئەمڕۆ ئامادەم بۆ جەنگ کردن لە پێناو بەرگریکردن لە تۆ، عوسمان پێی وت: پێویست ناکات جەنگ بکرێت.

زەیدی کوڕی ثابت چووە ماڵی عوسمان و وتی: ئەوە برایانی ئەنصار لای دەرگاکەن و دەڵێن ئێمە دووجار دەبینە پشتیوان جارێک بۆ پێغەمبەر و جارێک بۆ عوسمان، ژمارەی ئەنصارو موهاجرین کەلەوێ بوون حەوسەد کەس دەبوون.

بەڵام عوسمان وتی: پێویست ناکات، دەستان دابگرن، ئەمڕۆ ئەگەر ئێوە گوێڕایەڵی من دەکەن چەکەکانتان دابنێن و هیچ مەکەن.

عوسمان ئامۆژگاری هەریەک لەو خەڵکانەی دەهاتن بۆ پشتیوانی بەم شێوەیە دەکرد: (خوێنڕشتنی هیچ کەسێک حەڵاڵ نیە مەگەر بە سێ حاڵەت نەبێت: موسوڵمان بێت و کافربێتەوە، کەسی خاوەن هاوسەر زینا بکات، یان کوشتنی کەسێک بەناحەق، ئایە ئەم خەڵکانە هیچ کام لەمانەیان تێدایە؟ هیچ کام لەوانەی هاتبوون بۆ پشتیوانی وەڵامیان نەبوو.

پاشان عوسمان داوای لێکردن کە بچنە دەرەوە...

خەلیفە بەهەموو شێوەیەک رەتی دەکردەوە کە خوێن بڕێژرێت و جەنگ دروستبێت، ئەو دەیویست کە کێشەکە بە ئامۆژگاری و نەرمی چارەسەر بکرێت، بەڵام ئاژاوە گێڕەکان هیچ جۆرە ئامۆژگاریەکیان وەرنەدەگرت و بەردەوام بوون لە گەمارۆدانی

ماڵەکە بۆماوەی چل رۆژ، لە پاش ئەوە چوونە ژورەوە بۆماڵەکەو چەند کەسێکیان شەهید کرد و پاشان چونە سەر خەلیفە کە لەوکاتەدا قورئانی دەخوێند ئایەتی(فَسَيَكْفِيكَهُمْ اللَّهُ...) یەکەمین دڵۆپە خوێن کەوتە زەوی، لە کاتێکد عوسمان بەرۆژوو بوو، رەحمەتی خوای گەورەی لێبێت و شەهید بوو گەڕایەوە لای خوای گەورە و ئەم شەهید بوونەی عوسمانیش جارێکیتر پێغەمبەرایەتی پێغەمبەر (صَلَّى الله عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) ی سەلماند کە هەواڵی شەهید بوونی دابوو پێی.

معبدی خوزاعی بە عەلی کوڕی ئەبو تاڵیبی وت:

هەواڵم پێبدە کە تۆ چۆن بویتە خەلیفەو عوسمانیش شەهیدکرا لەکاتێکدا تۆ سەرت نەخست؟

عەلی وتی: عوسمان ئەمیرو خەلیفەی ئێمەبوو، ئەو بۆخۆی رێگری لێماندەکرد کە جەنگ بکەین دژی ئاژاوەگێڕەکان، هەتا دەیفەرموو: هەرکەس شمشێر رابکێشێ لەمن نیە، ئیتر چۆن جەنگ بکەین و بێ فەرمانی خەلیفەکەمان بکەین.

معبد وتی: ئەی عوسمان کە لە پلەی خەلیفەدایە چۆن دەبێ ئاوا تەسلیمیان بێت هەتا شەهیدی دەکەن؟

عەلی وتی: هەروەک چۆن کوڕەکەی ئادەم بە براکەی وت: ئەگەر بشمکوژی ئەوا من هەوڵ نادەم تۆ بکوژم، چونکە لە خوای گەورە دەترسم کە خوێنی کەسێک بڕێژم بەناحەق.

عوســـمانی کــوڕی عەفــان لە ڕۆژی جــومعە لە ١٨ ذي الحجــة ســاڵی ٣٥ هیجــری شەهیدکرا (ڕەزاو ڕەحمەتی خوای گەورەی لێبێت).

**سەرنج:**

لەوانەیە خەڵکانێک بڵێن باشە عوسمان چۆن ئاوا بەو شێوەیە شەهیدکرا لە کاتێکدا مەدینە شوێنی هاوەڵە بەڕێزەکانی پێغەمبەر بوو، لە وەڵامدا دەڵێین:

١-هیچ کەس پێشبینی ئەوەی نەدەکرد کە کارەکە بگاتە ئەوەی کە عوسمان شەهید بکەن.

٢-هاوەڵەبەڕێزەکان ڕێگریان لە ئاژاوەگێڕەکان کرد زۆر بەتوندیش، بەڵام عوسمان سەرەڕای ئەو هەڵوێستە ناشرینانەی دەبینی لە ئاژاوەگێڕەکان کەچی داوای لە هاوەڵان دەکرد کە چەکەکانیان دابنێن و دوربکەونەوە لێیان، ئەوانیش وایانکرد کە عوسمان دەیفەرموو.

٣-لەو کاتەدا هاوەڵانێکی زۆر لە مەراسیمی حەجدا بوون وە هەندێکیشیان دەرچووبوونە دەرەوە بۆ ریزەکانی سوپا هەتا بەشداری جیهاد بکەن دژی کافرانی رۆم، بۆیە فیتنە بازەکانیش ئەمەیان بە فرسەت زانی و کوشتنی عوسمانیان ئەنجامدا.

٤-ژمارەی ئاژاوەگێڕەکان کە هاتبونە ناو مەدینە نزیکی هەزار جەنگاوەر دەبوون وە بەهۆی ڕۆیشتنی خەڵکی مەدینە بۆ جیهاد کردن ئەو ژمارە زۆرە جەنگاوەر نەبوو لەوێ.

٥-زۆرێکیش لە هاوەڵان لەترسی ئەم فیتنەیە کەنار گیریان کردبوو لە ماڵەکانی خۆیاندا هەتا ئەگەر بۆ مزگەوتیش بهاتنایە ئەوا شمشێریان لەگەڵ خۆیان دەبرد.

هەنـدێک کەس دەڵـێن کە گـوایە هەنـدێک لە هـاوەڵان رازی بـوون بەو کوشـتنە، ئەمە بەڕاستی جگەلە درۆیەکی گەورە هیچیتر نیە، بەڵکو هەموو هاوەڵان دژی ئەو کارەبوون و بەریان پێدەگرت بەڵام ئاژاوە گێڕەکان فرسەتیان هێناو ئەنجامیاندا، بەڵام هەندێک لە هاوەڵان لەگەڵ ئەوەدا بوون کە عوسمان لە خەلیفایەتی لاببرێت، وەک (عەمماری کوڕی یاسر، محمد کوڕی ئەبو بەکر و هەندێکیتر...) موسولْمانان دەبێت زۆر ئاگاداربن لەو ریوایەتە ناڕاستانەی کە دەگێڕێتەوە دەربارەی ئەم روداوە، کە زۆرێکی بۆ شێواندنی رێزو پلەی هاوەڵانە.

## "خەلافەتی عەلی کوڕی ئەبو تاڵیب"

## لە مانگی "ذي الحجة" ی ساڵی ٣٥ هیجری بۆ مانگی "ڕەمەزان"ی ساڵی ٤٠ هیجری

**بیرخستنەوەیەکی سەرەتا:**

لەدوای شەهید کردنی عوسمان بەیعەت درا بە عەلی کوڕی ئەبو تاڵیب، کۆچەران و پشتیوانان هەموویان بەشداری بەیعەتەکەبوون، ئەوەشی لەوێ ئامادەبوو ئەوانیش بەیعەتیان پێدا، بەیعەتەکە نوسرایەوەو نێردرا بۆ هەموو ناوچەکان و هەموو خەڵکەکەش ڕازیبوون و بەیعەتیان پێدا جگەلە موعاویەی کوڕی ئەبو سوفیان و خەڵکی شام نەبێت کە بەیعەتەکەیان هێشتەوەو نەیاندا.

بوخاری بۆمان دەگێڕێتەوە لە سەلەمەی کوڕی ئەکوەع و دەڵێت: (عەلی لە جەنگی خەیبەردا بەهۆی چاو ئێشەوە نەهاتبوو بۆ جەنگەکە، پاشان عەلی وتی: من دەبێ لەماڵەوەبم و پێغەمبەریش صَلَّى الله عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لەوێبێت، عەلی دەرچوو بۆ لای پێغەمبەرو پێی گەیشت، ئەو شەوەی کە بۆ بەیانیەکەی خەیبەر فەتح بوو پێغەمبەر صَلَّى الله عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فەرمووی: ( سبەی ئەم ئاڵایە ئەدەمە کەسێک کە خوای گەورە و پێغەمبەری خۆشدەوێ یان خوای گەورەو پێغەمبەر ئەویان خۆش دەوێت، لەسەر دەستی ئەو خوای گەورە فەتحی خەیبەرمان پێدەبەخشێت، عەلی هات و پێغەمبەر ئاڵاکەی تەسلیمی ئەو کردو خەیبەریش ئازادکرا) ئیبن و حەجەری عەسقەلانی لە واتای ئەم فەرمودەیە دەفەرموێت: (لە فەرمودەکەدا کە دەڵێت خواو پێغەمبەر عەلیان خۆشدەوێت یان عەلی خواو پێغەمبەری خۆشدەوێت) ئەمە خۆشەویستیەکی

تەواوەتی و راستەقینەیە کە عەلی هەیبووە، وە هەموو موسوڵمانێکیش بەشدارە لەو خۆشەویستیە وەک عەلی، چونکە خوای گەورە دەفەرموێت: (قُلْ إِنْ كُنْتُمْ تُحِبُّونَ اللَّهَ فَاتَّبِعُونِي يُحْبِبْكُمُ اللَّهُ) واتە : پێیان بڵێ ئەگەر خواتان خۆشدەوێت ئەوا شوێن من بکەون واتە شوێن پێغەمبەر صَلَّى الله عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وە کە ئەوەتان کرد ئەوا خوای گەورە ئێوەی خۆشدەوێت)

ئەمەش بەڵگەی ئەوەیە کە عەلی رەزاو رەحمەتی خوای گەورەی لێبێت بە تەواوی شوێنکەوتی پێغەمبەر بووە، بۆیە وەسفی خۆشەویستی خواو پێغەمبەرەکەی وەرگرتووە، کەوایە خۆشویستنی عەلی لە ئیمانەوەیە و رق لێبونەوەشی لە نیفاقەوەیە.

هەروەها ئیمامی ئەحمەد دەفەرموێت: هەرکەس دەیەوێت نمونەی هاوەڵی پێغەمبەر ببینێت ئەوا با تەماشای ژیانی عەلی بکات.

**ئاژاوەیەکی نوێ:**

لەدوای شەهید کردنی عوسمان و ناشتنی، تەواو بونی بەیعەت بە عەلی کوڕی ئەبوتالیب، خەڵکەکە داوای تۆڵەکردنیان دەکردەوە لە بکوژانی عوسمان بە شێوەیەک کە تورەبوون بێتاقەتی باڵی کێشابوو بەسەر خەڵکی مەککەو مەدینەدا، تەڵحەی کوڕی عوبەیدوالله و زوبێری کوڕی عەوام پێشەنگی ئەم داواکاریەی خەڵکی مەدینەیان هەڵگرتبوو وە داواشیان دەکرد کە بەزوترین کات بکوژانی عوسمان بە چارەنوسی خۆیان بگەن، لەپشت ئەم داواکاریەی خەڵکی مەدینە هیچ شتێکی شاراوە نەبووە تەنها هاوسۆزی بووە بۆ شەهید بوونی عوسمان بەناحەق، ئەم دەنگی

نارەزاییەی خەڵکی مەککەو مەدینە بەصرەشی گرتەوە و هەموو داوای تۆڵەی شەهید بوونی عوسمانیان دەکرد.

والی بەصرە کەناوی عوسمانی کوڕی حەنیف بوو ئەویش بووە یەکێک لە ناڕازیەکان و چووە پاڵ تەڵحەو زوبێرو عائیشە.

عەلی کوڕی ئەبوتاڵیب بە سوپایەکەوە چوو بەرەو بەصرە بۆ ئەوەی کێشەکان چارەسەر بکات و ئارامی بگەڕێنێتەوە بۆ ناوچەکان و قەناعەت بە دەنگە ناڕازیەکان بکات هەتا کێشەکە چارەسەر دەبێت، وە توانیشی ئەو کارەبکات و هەردوولا کەوتنە رێکەوتن و لەیەکتر تێگەیشتن، عەلی ئەوەی بیر زوبیر خستەوە کە پێغەمبەر (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) پێی فەرمووە کە (بەڵام تۆ جەنگ دەکەیت و لەو جەنگەشدا لەبەرەی زوڵم دەبیت) زوبیر وتی: بەڵێ راستەکەیت ئێستا بیرمکەوتەوە، هەرچەند زوبێر هەوڵیدا کە خۆی بەدوربگرێ لەو جەنگەو دورە پەرێزی هەڵبژارد بەڵام بەداخەوە لەڕێی چەند کەسێکەوە شەهیدکرا.

کۆمەڵێ خەڵکی ئاژاوەگێر هەبوون کە دەستیان هەبوو لە کوشتنی عوسماندا بەم رێکەوتنە رازینەبوون، بۆیە هەوڵیان ئەدا کە جەنگ بەرپابێت، هەردوو سەربازگەی عەلی و تەڵحە لەڕێی فێڵی ئەو ئاژاوە گێڕانەوە تێکەڵ یەکران و پاشان کۆمەڵێک هێرشیان کردە سەر یەکتری و جەنگ دەستی پێکرد و ئاشتەوایەکە تێکچوو.

**جەنگی جەمەل:**

لە مانگی "جمادی الاخر" لە ساڵی ٣٦ هیجریدا ئاژاوەگێڕەکان سەرکەوتوبوون لە هەڵگیرسانی جەنگ لەنێوان سوپای عەلی و تەڵحەدا، هەردوولا کەوتنە جەنگ کردن

دژی بەیەک و لەبەردەم ئەو حوشترەی کە عائیشە لەسەری بوو پێکدادان دەستی پێکرد، نزیکی حەوت پیاو لەو شوێنەدا کوژران، عەلی کە ئەمەی بینی فەرمانیکرد کە دەوری حوشترەکە بگرن هەتا عائیشە بپارێزن، عائیشە بە سەلامەتی رزگاری بوو لەو جەنگەو عەلی کۆمەڵێ سەربازی کرد بە پارێزەری و گەڕاندیەوە بۆ مەدینە، لە سوپای بەصرە نزیکی دە هەزار کەس و لە سوپای عەلیش نزیکی پێنج هەزار کەس کوژران.

لەدوای سەرکەوتنی سوپای عەلی و دەستگرتن بەسەر ناوچەکەدا ئارامی گەڕایەوە و خەڵکەکەش چونەوە ژێر دەسەڵاتی عەلی، ئەوەی کە مایەوە لە کێشەکان تەنها شام بوو کە موعاویە بەهەمان شێوە رازی نەبوو بە بەیعەتدان بە عەلی هەتاوەکوو بکوژانی عوسمان بە سزای خۆیان نەگەن.

**جەنگی صەفین:**

لەمانگی موحەڕەمی ساڵی ٣٧ هیجریدا عەلی ویستی کە موعاویە لە والی شام لابدات، بەڵام موعاویە فەرمانی عەلی کە خەلیفەبوو رەتیدایەوە، عەلی بە سوپایەکەوە بەرەو شام کەوتەڕێ وە موعاویەش بە سوپایەکەوە دەرچوو بەرەو لای عەلی.

عەلی هەواڵی نارد بۆ موعاویە کە کێشەکان چارەسەربکەن و کۆتای بەم ململانێیە بهێنرێت، بەڵام هەوڵەکان هیچی سەرکەوتوو نەبوو، لەناوچەی صەفین جەنگ دەستیپێکرد و عەماری کوڕی یاسر کە هاوەڵی پێغەمبەربوو لەسەر دەستی سوپای موعاویە شەهیدکرا، ئیتر ئەو فەرمایشتەی پێغەمبەر (صَلَّى الله عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) کە فەرمووبوی دەربارەی عەمار (تۆ کۆمەڵەی دەرچووەکان یان یاخیەکان دەتکوژن)، کە ئەمە بڵاوکرایەوە سوپای موعاویە توشی داڕوخان بوو، عەمری کوڕی عاص کە لە

سـوپای موعـاویه بـوو پێشـنیاری کـرد بـۆ سـوڵحکردن، سـوپای موعـاویه قورئانیـان بەرزکردەوەو داوای سوڵحیانکرد.

ئەم شـێوازەی سـوپای موعـاویە کە کردیـان عەلی هەسـتیکرد کە ئەمە فێڵـێکە، بەڵام زۆرینـەی هـاوەڵان کە لە سـوپای عەلی بـوون پێـداگریان کـرد لەسـەر ئەوەی کە قبـوڵی سوڵحکردن بکەن.

**سوڵحکردن:**

قسـە زۆر دەکرێت لەسـەر ئەم سـوڵحکردنەی نێـوان عەلی و موعـاویە لە دوای جەنگی صـەفین، وە ئەنجـامی سـوڵحەکەش، هەنـدێک دەڵـێن کە گوایە عەمری کـوڕی عـاص فێڵی لە ئەبـو موسـای ئەشـعەری کـردووە، ئەمەش دوورە لە رەفتـاری عەمـری کـوڕی عاص کە هاوەڵی پێغەمبەر بووە (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)، یان دەڵێن کە عەمر داوای لە ئەبـو موسـای ئەشـعەری کـردووە کە رێکبکەون لەسـەر ئەوەی کە عەلی لە خەلافەت لابرێت و پاشـان پشـتگیری موعـاویە بکرێت بـۆ بـوون بە خەلـیفە، هەمـوو ئەم قسـانە دوورن لەڕاسـتیەوە و هـیچ بنەمـایەکی زانسـتی نـیە و ریوایەتەکـان هەمـووی لاوازو هەڵبەستراون.

مێـژوو نوسـان لە کـۆن و نـوێ هەموویـان لەسـەر ئەوە هـاوڕان کە موعـاویە ئەو بەرهەڵستیەی بەرامبەر عەلی کردووە بۆ ئەوە نەبووە کە عەلی لە خەلافەت لابچێت و خـۆی بچێـتە شـوێنی، بەڵکـو موعـاویە داوای ئەوەی کـردووە کە بکـوژانی عوسـمان بە سزای خۆیان بگەیەنرێت، ئەمەش لەبەر ئەوەی کە موعاویە خۆی بە میراتگری خوێنی عوسـمان دانـاوە چـونکە خزمی نزیکی موعـاویە بـووە، ئەم بۆچـونەی موعـاویەش هەڵە

بووه چونكه كێشەی عەلی ئەوەنەبووە كە نەیەوێت خوێنی بەناحەق رژانی عوسمان لە بکوژانی وەرنەگرێتەوە، بەڵكو كێشەكە لەوە گەورەتربووە لە دیدگای عەلیەوە ئەویش ئەوەبووە كە عەلی پێیوابووە هەتا هەموو ناوچەكان سەقامگیرنەبێت و نەیەنەوە ژێر ركێفی دەسەڵاتی عەلی ئەوا ناتوانێ ئەم كارەبكات، لەبەر ئەمەش بووە كە عەلی بە زوبێرو تەڵحەی وت: (ئەرێ چۆن من حوكم لەسەر خەڵكانێک بدەم وەک سەرۆكیان لەكاتێكدا كە بەیعەتیان پێنەدابێتم و نەبوو بێتمە خەلیفەیان، ئەگەر هەموو لایەک هاتنە ژێر ركێفی حوكمی من ئەوكات دەشتوانم حوكمیان لەسەر بدەم)

پاشان عەلی دەڵێت: (ئەم جۆرە كارانە جێبەجێ ناكرێت هەتا وەكوو خەڵكەكە هادی نەبنەوەو رەوشەكە سەقامگیرنەبێت ئەوكات دەتوانرێت حەق بگەڕێنرێتەوە بۆ خاوەن حەق)

ئەنجامی سوڵحكردنەكە بەوە دەرچوو كە عەلی لە خەلافەت لاببرێت، پاشان ئوممەت دیاریبكات كە كێ ببێتە خەلیفە، وە بۆ جێبەجێكردنی كاروباری دەوڵەت و ئیدارەی خەلافەتەكە وایان دانا هەریەک لە عەلی كە حوكمی ئەو شوێنانە بكات كە پێشتر حوكمی كردووە جگەلە شام وە موعاویەش حوكمی شام بكات هەتا ئەو كاتەی كەسێک دیاری دەكرێت بە خەلیفە.

عەلی كوڕی ئەبو تالیب ئەم ئەنجامی سوڵحكردنەی قبوڵ نەبوو وە رەتیشی كردەوە چونكە فەرموی ئیشی ئەو كەسانەی كە سوڵحەكەیان كردووە ئەوە نیە كە خەلیفە لا ببەن ئەوان ناتوانن كاری وابكەن بەڵكو ئەوان بۆ ئەوە راسپێراون كە رێكەوتنێک بكەن

لەسەر بابەتی شەهید کردنی عوسمان و تۆڵە سەندنەوەی بکوژانی عوسمان کە ئێستابکرێت یان دوابخرێت.

رێکەوتنەکە هەڵوەشایەوەو عەلی سوپاکەی خۆی ئامادەکرد بۆ هێرش کردنە سەر موعاویە، بەڵام شتێکی چاوەڕوان نەکراو رویدا لەناو هێزەکەی عەلیدا.

**دەرکەوتنی خەواریج:**

کۆمەڵێک لە سوپاکەی عەلی جیابونەوە کە ژمارەیان (١٢٠٠٠) کەس دەبوو، ئەمانە رێکەوتن و سوڵحی عەلیان لەگەڵ مەعاویە پێ هەڵەبوو، وە دەشیان وت کە عەلی بەم سوڵحکردنە کافربووە، چونکە دەبوو قورئان بکاتە حوکمی نێوانیان کەچی ئەو دووکەسی داناوە مەبەست لێی ئەبو موسای ئەشعەری و عەمری کوڕی عاص بووە، ئەم ئایەتەیان دەکردە بەڵگەی کافربوونی عەلی (وَمَنْ لَمْ يَحْكُمْ بِمَا أَنزَلَ اللَّهُ فَأُوْلَئِكَ هُمْ الْكَافِرُونَ) واتە: ئەوەی حوکم بەوە نەکات کە خوای گەورە ناردویەتی ئەوا لە بێباوەڕانە.

کاتێک ئەم کۆمەڵە خەڵکە گەڕانەوە بۆ کوفە و لە سوپاکە جیابونەوە لە شوێنێک نزیک کوفە نیشتەجێ بوون کەناوی (حروراء) بوو، ئالەمەوە بوو کە بە خەواریجەکانیش دەوترا حروریەکان.

زۆرێک لەو هاوەڵە بەڕێزانەی کە زانا بوون کەوتنە گفتوگۆکردن لەگەڵیانداو ئەو گومان و هەڵە حاڵیبونەی هەیان بوو بۆیان رونکردنەوە، زۆرێکیان بەو بەڵگەو قسانەی بۆیان کردن پەشیمان بوونەوەو گەڕانەوە ناو ریزی موسوڵمانان و وازیان لەو بیرودیدە هێنا، ئەوەی کە مایەوە لەساڵی ٣٨ هیجریدا کەوتنە جەنگردن دژی عەلی

کوڕی ئەبو تاڵیب و لەو جەنگەشدا شکستیان بەسەردا هاتوو زۆرێکیان کوژران و چەند کەسێکی کەمیان مانەوەو دواتریش ئەم بیروباوەڕە بووە بیست گروپ و تاقم.

لەساڵی ٣٩ هیجریدا عەلی و موعاویە رێکەوتنێکیان کردو جەنگیان راگرت لە دژی یەک، لەسەر ئەو مەرجەی کە عەلی کوڕی ئەبو تاڵیب حەقی بەسەر شامەوە نەبێت و لەژێر حوکمڕانی موعاویەدا بمێنێتەوە.

لەساڵی ٤٠ هیجریدا لەو خەواریجانەی کەمابوون پلانێکیان دانا بۆ کوشتنی عەلی و موعاویەو عەمری کوڕی عاص، بەڵام سەرکەوتونەبوون لە پلانەکەدا جگەلە هێرشەکەی سەر ئیمامی عەلی کە سەری گرت و بووە هۆی شەهید کردنی عەلی کوڕی ئەبو تاڵیب.

لەرۆژی ١٦ رەمەزاندا ساڵی ٤٠ هیجری دووکەس لە خەواریجەکان لە پێش بانگی بەیانیدا لەبەردەم مزگەوتدا هێرشیان کردە سەر ئیمای عەلی و شەهیدیان کرد و هاواریانکرد (سەرکەوتوبوین سوێند بە خوای کەعبە)[١].

---

[١] بەڕاستی کاتێک گوێت لە بیستنی ئەم جۆرە قسەیە دەبێت لە کەسێکی موسوڵمانەوە کە خەلیفەی موسوڵمانانی وەک ئیمامی عەلی شەهید کردووە تەزوو بە گیانتادێت، ئاخر دەبێت ئەم جۆرە فیکرو بۆچونە چەند بۆگەن و خراپ بێت کە وا لەکەسێک بکات هاوەڵ و خەلیفە و دۆستی پێغەمبەر بکوژێ و پاشان بشڵێ من کارێکی باشم کردووە و سەرکەوتوبوم، خوای گەورە ئەم ئوممەتە بپارێزێ لەم جۆرە بیروفیکرە، بەڕاستی فیکری خەواریج میکرۆبێکی کوشندەیە بۆسەر ئوممەتی ئیسلام.(وەرگێڕ)

لەدوای هێرشـكردنە سـەر ئیمـامی عەلی خەڵـكەكە هەمـووی بە خێـرای كۆبـونەوەو هەردوو كەسـەكەیان گـرت نەیـان هێشـت دەربـازبن، پاشـان چـونە لای ئیمـامی عەلی لەكاتێكـدا دوا هەناسـەی دەكێشـا، پێیـان وت كە چی لەو دووكەسـە بكەیـن كە ئەم كارەیان كـردووە؟ عەلی فەرمووی: (ئەگەر ژیـام و نەمـردم ئەوا خـۆم حوكمیـان لەسـەر ئەدەم، ئەگەر منـیش مـردم ئەوا شـتەكە لای ئێـوە دەبێـت، یـان ئەوەیە هەرچیـان لێكردوم وایان لێبكەنەوە یان لێیان خۆشبن ئەمەش باشترەو چاكترە).

لە مـانگی شـەوالی سـاڵی ٤٠ هیجریـدا خەڵكی مەدینـە بەیعەتیانـدا بە حەسـەنی كـوڕی عەلی بۆ بوون بە خەلیفە.

لە ٢٥ "ربیع أول"ی سـاڵی ٤١ هیجـری حەسـەنی كـوڕی عەلی وازی لە خەلافەت هێنـاو تەسـلیمی موعـاویەی كـوڕی ئەبـو سـوفیانی كـرد لە پێنـاو یەكخسـتنەوەی ئـوممەتی ئیسـلام، كە نزیكی شـەش مانـگ لەسـەر حـوكم مـایەوە وەک خەلـیفە، ئەو سـاڵەش لەبەر ئەو كـارە پیرۆزەی كە حەسـەنی كـوڕی عەلی كـردی نـاونرا (عـام الجماعـة) واتە: سـاڵی كۆبـونەوە، ئەم كـارەی حەسـەن بەڵـگەی راسـتیەتی پێغەمبەرایەتـی پێغەمـبەر (صَـلَّى الله عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ) پیشـان ئەدات كە پێغەمـبەر فەرمووبـووی بە حەسـەن(ئەم نەوەی مـن گەورەو سـەیدە، خـوای گەورە ویسـتی لەسـەر بێـت دەبێـتە مـایەی ئاشتبوونەوەی دوو كۆمەڵی گەورەی موسوڵمانان).

**سەرنجێكی گرنگ:**

ئیمـامی قورتـوبی كۆمەڵێـک وتەی جـوانی هەیە دەربـارەی ئەم كێشـەو جەنگـانەی كە رویانـداوە لەنێـوان هـاوەڵانی پێغەمبەر، كە جـێگەی خـۆیەتی لێرەدا بیـانهێنیەنەوە بـۆ

بەرچاوڕونی خوێنەران، قورتوبی لە تەفسیرکردنی ئەم ئایەتەدا باسەکان دەخاتەڕوو کە خوای گەورە دەفەرموێت: (وَإِنْ طَائِفَتَانِ مِنْ الْمُؤْمِنِينَ اقْتَتَلُوا فَأَصْلِحُوا بَيْنَهُمَا فَإِنْ بَغَتْ إِحْدَاهُمَا عَلَى الأُخْرَى فَقَاتِلُوا الَّتِي تَبْغِي حَتَّى تَفِيءَ إِلَى أَمْرِ اللَّهِ فَإِنْ فَاءَتْ فَأَصْلِحُوا بَيْنَهُمَا بِالْعَدْلِ وَأَقْسِطُوا إِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ الْمُقْسِطِينَ)

واتە: (ئەگەر دوو کۆمەڵی موسوڵمانان کەوتنە جەنگکردن دژی یەکتری ئەوا هەڵبدەن کە نێوەندگیریان بکەن، ئەگەر لایەکیان زیادەڕەوی کردو ستەمی کرد ئەوا جەنگی لەگەڵ بکەن هەتا واز لەو دەستدرێژیە دەهێنێت، ئەگەر وازی هێنا ئەوا سوڵح بکەن لەنێوانیاندا بە دادپەروەری و خوای گەورە داد پەروەرانی خۆشدەوێت).

ئەم ئایەتە باس لە جەنگکردنی نێوان موسوڵمانان دەکات، ئەو جەنگانەی لەنێوان هاوەڵانیشدا رویانداوە لەناو ئەم ئایەتەدا خۆی دەبینێتەوە، کاتێک جەنگ لەنێوان عەلی و موعاویە رودەدات و عەماری کوڕی یاسر شەهید دەکرێت هاوەڵان ئەو فەرمودەیەی پێغەمبەر (صَلَّى الله عَلَيْـهِ وَسَلَّمَ) دەهێنەوە کە بە عەماری فەرمووبوو (تقتل عمارا الفئة الباغية) واتە: عەمار کۆمەڵی یاخی دەیکوژن، ئێ ئەمەش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە سوپای موعاویە عەمار شەهید دەکەن کەوایە سوپای موعاویە لە کۆمەڵەی یاخیانە، هەروەها کاتێک خەواریجەکان لە سوپای عەلی جیادەبنەوەو دەکەونە جەنگکردن دژی سوپای عەلی ئەمانەش بەدڵنیایەوە لە کۆمەڵەی یاخیان هەژماردەکرێن، هەموو زانایانی ئەهلی سونە لەسەر ئەوە کۆکن کە عەلی کوڕی ئەبو تاڵیب لەسەر حەق بووەو ئەوانیتر "فیئة الباغی" بوون.

کێشەکان لەوەوە سەرچاوەی گرت کە کاتێک عوسمانی کوڕی عەفان شەهیدکرا بە بێ تاوان وە عەلیش هاتە سەر خیلافەت، عەلی کوڕی ئەبو تاڵیب پێی وابوو کە وەرگرتنەوەی تۆڵە لە بکوژانی عوسمان دەبێت دوابخرێت هەتا ئەو کاتەی کە دەوڵەتەکە خۆیدەگرێت و ناوچەکە ئارامدەبێتەوە لەو ئاژاوەیەی کە بەدرێژای چەندین ساڵە دروستبووە، زانایانیش قسەکانی عەلی بە حەقتر دەزانن لە بەرامبەر ئەوانیتر کە پەلەیاندەکرد لە عەلی بە زووی سزای بکوژان وەربگرێتەوە، عەلی دەیفەرموو باشە ئەگەر ئێوە بەیعەت نەدەن بەمن ئیتر من چۆن حەقی عوسمان وەربگرم لەو بکوژانە لەکاتێکدا من وەک خەلیفە نەناسرابێتم، بەمەش عەلی لەسەر حەق بوو، چونکە عەلی دەیووت ئەوانەی دەستیان لە کوشتنی عوسماندا هەبووە هەموویان خاوەن عەشرەتن بە دڵنیایەوە کە بکوژرێن دەمارگیری عەشائیری وادەکات کە جەنگێکی گەورە توشمان ببێت، بەڵام کە هەموو ئوممەت لەسەر ئەوە رێکەوتن کە خەلافەت لای کەسێک بێت ئەوا منیش لەدوای لێکۆڵینەوەو راوێژکردن بە ئەهلی حەل و عەقد هەڵدەستم بە ئەنجامدانی سزادانی بکوژانی عوسمان.

هەروەها راجوێی نیە لە نێوان ئوممەتدا کە خەلیفە دەتوانێت سزای کوشتن دوابخات لە کاتێکدا هەست بەوە بکات کە ئاژاوەو فیتنەیەکی گەورە سەر هەڵدەدات بە ئەنجامدانی سزاکە، تەڵحەو زوبێر هەردوکیان کێشەیان ئەوەنەبوو کە عەلی لەسەر خەلافەت لاببەن یان پێی رازینەبن بەڵکو ئەوان مەبەستیان بوو کە بکوژان بە سزای خۆیان بگەن.

هەر ئەم کێشـەیەش بـوو کە بـووە هـۆی هەڵگیرسـانی جەنـگ لەنێوانیانـدا، لە کاتێکـدا تەڵحەو زوبێرو عائیشە کە چوونە بەصرە بەمەبەستی هەڵگیرسانی جەنگ نەچوون وە عەلـیش کە بە سـوپاکەوە چـوو بـۆ بەصـرە هەر مەبەسـتی جەنـگ نەبـوو، بەڵام هەڵگیرسـانی جەنـگەکە دەسـتێک بـوو لەنـاو هەردوولا بـۆ ئەوەی رێکەوتـن نەکرێـت، ئەمەش لە مەسڵەحەتی بکوژانـدا بـوو، چـونکە سـەقامگیربوونی واقیعەکە رێخۆشکەر دەبـوو بـۆ دۆزینـەوەی بکـوژانی عوسـمان و بە سـزا گەیانـدنیان، لەهەردوولای سـوپاکە کەسانی خائین هەبوون کە دەستیان هەبوو لە هەڵگیرسانی جەنگەکە.

پاشـان قـورتوبی دەڵێت: نابێت هیچ کەس لە هـاوەڵان بەوە تۆمەتبـاربکەین کە تاوانبـارە بە کوشـتنی موسـوڵمانان، چـونکە هەریەک لەو هـاوەڵانە ئیجتیهادیـان کـردووە پێیـان وابـووە ئەوە باشـترە بـۆ موسـوڵمانان و ئـوممەتی ئیسـلام، هەمـوو ئەوانەی لەو جەنگـانەدا کـوژراون لە ئـوممەتی ئیسـلام حسـاب دەکـرێن، وە بە پێشـەواو پێشـینی خۆمانیـان دەزانـین، هەرگیز باسـیان نـاکەین مەگەر ئەوەی بە باشـە نەبێـت، چـونکە رێزگرتنی هاوەڵان لە ئیمانەوەیە، پێغەمبەر (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) رێیگرتووە لەوەی کە قسەی ناشرین دەربارەی هاوەڵان بوترێت، چەندین فەرمودەی صەحیح هەیە کە باس لە حەرام بـوونی قسـەوتن دەکات دەربـارەی هـاوەڵان، وە دەیـان ئـایەتی قـورئانمـان هەیە کە باس لە گەورەی و لێخۆشبونی هاوەڵان دەکات، لەبەر درێژنەبونەوەی باسـەکە دەنا هەموو ئەو ئایەت و فەرمودانەمان دەهێنایەوە کە وتراون لە فەزڵ و گەورەی هاوەڵان.

ئەوەی لەسـەر ئـێمەیە کە ئەو ئیجتیهـادەی هـاوەڵان کردویـانە ئەگەر هەڵەبـوون یـان کەمتەرخەم بووبێتن ئێمە خۆمان بەدوور بگرین لە قسەوتن پێیان، یان تەکفیر کردن و لەعـنەت کـردن و تەفسـیقکردنیان، وە ئەو هەمـوو فەزڵ و گەورەیەی کە کردویـانە

بەرامبەر ئیسلام و موسوڵمانان ناکرێ ئێمە لەبیری بکەین و بێ ئەرزش سەیری بکەین، بۆ ئەم جۆرە کێشانە خوای گەورە لە قورئاندا ئاڕاستەمان دەکات و دەفەرموێت: ﴿تِلْكَ أُمَّةٌ قَدْ خَلَتْ لَهَا مَا كَسَبَتْ وَلَكُم مَّا كَسَبْتُمْ وَلَا تُسْأَلُونَ عَمَّا كَانُوا يَعْمَلُونَ ﴿١٤١﴾﴾ البقرة: ١٤١

واتە: (ئوممەتانی پێشتر هەرچیانکردووە خۆیان بەرپرسیارن لێی، وە خۆشیان باجەکەی وەردەگرن، لەبەر ئەوە پرسیارمەکە دەربارەیان کە چیان کردووە)

لەبەر ئەوە ئێمە مادام خۆمان دەستمان نەبووە لە رشتنی ئەو خوێنە با زمانیشمان بپارێزین لێی، لەبەر ئەوە رۆچوون لەناو ئەم مێژووە و قسەکردن دەربارەی کەسایەتیەکان کارێکی باشە نییە، پرسیاریانکردووە دەربارەی ئەم جەنگە لە حەسەنی بەصری فەرمویەتی: (ئەم جەنگە هاوەڵان تیایدا ئامادەبون و ئێمە لەوێ نەبووین، ئەوان شارەزاترن بەو واقیعەو ئێمەش لێرەوە بێ ئاگاین، ئەوان کۆبونەتەوە ئێمە شوێنیان دەکەوین، وە لەو شتانەشی کە جیاوازیان تێکەوتووە ئێمە دەوەستین و بێدەنگ دەبین).

بەهەمان شێوەش "المحاسبی" دەڵێت: ئێمە هەمان ئەو قسەیە دەکەینەوە کە حەسەنی بەصری وتویەتی، هەموومان باش دەزانین کە هاوەڵان خۆیان لەو واقیعەبوون باشتر شارەزابوون لەوەی کە چیبکەن و چینەکەن، ئێمە لەو شتانەی کە هاوڕابوون شوێنیان دەکەوین وە لەو شتانەشی کە جیاوازبوون تیایدا دەوەستین، نایەین لێرەوە رەئی خۆمان بدەین لەسەر شتانێک کە خۆمان تیایدا نەژیاوین، وە هەمووشمان دەزانین ئەوان ئیجتیهادیان کردووە، لای خواش کامیان لەسەر صەواب

بووبێـت ئەویـان دووجـار پاداشـتی وەرگرتـووە، هەرگیز بـۆ ئـێمە نابێـت کە ئەو هـاوەڵە بەڕێــزانە بە دوور لەدیــن و خــراپ باســبکەین، داوا لە خــوای گەورە دەکەیــن کە لە ئەوانیش و ئێمەش خۆشبێت...

تەواو بوم سوپاس بۆ خوای خاوەنمان

هادی شارباژێڕی

٢٠١٩\١٠\٢٣

# ناوەرۆك

